# مرۆڤی نیادرتاڵ

## لە نێوان هەبوون و نەبوونی فیزیکیدا

## خوێندنەوەیەک بۆ تەمەنی عائیشە و بیری د.سروش و قەبانچی








سەلام ناوخۆش

# مرۆڤی نیادرتاڵ

## لە نێوان هەبوون و نەبوونی فیزیکیدا

## خوێندنەوەیەك بۆ تەمەنی عائیشە و بیری د. سروش و قەبانچی

سەلام ناوخۆش

هەولێر ٢٠١٢

پێناسی کتێب:

ناوی کتێب : مرۆڤی نیادرتال

ناوی نووسەر: سەلام ناوخۆش

بابەت: کۆمەڵایەتی

دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن

( ٧١٤ )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێ دراوە.

پێشکەشە بە:

**هاوژینەکەم ، مامۆستا کەلسومە**

**هەروەها ئەوانەی لە نەخۆشیکەم بە سەردان و نامەناردن بە سەریان کردمەوە**



## پێشەکی

ئەم کتێبە لە سێ تەوەرەی جودا پێکهاتووە.سێ تەوەرەکە لەوە پێکدەچن بەوەی هەر سێ بە تایبەتی لە کۆمەڵگای کوردی ئارێشاوی و بارگەکراون بە هەندێ کێشەوە .بە واتای دوو تەوەرە لە بنەڕەتەوە کێشەیان نییە!

تەوەرەی یەکەم بە هۆی کۆنیەکەوە بۆتە بەشی یەکەم!لەم تەوەرەیەدا باس لە بوونی ئادەم وەك کاراکتەرێکی سەرەکی دەکەین . ئادەم لە نێوان پێغەمبەربوون و مرۆڤبوون قسەی لە سەر دەکرێت هەروەها مەسەلەی بەهەشت لێبوونەکەی لە نێوان بەهەشتی نەمری و باخێك لە باخەکانی زەوی گەنگەشە و دایەلۆکی لە بارەوە دەکرێت ! ئەو شوێنەی ئادەمی لێبووە چ بەهەشت بێت یان باخێکی سەر زەوی هیچ لە باوەڕی توێژەر ناگۆڕێت .ئەمە مانای ئەوە نییە کە من

باوەڕێکی کوێرانەم هەیە . بەلکو باوەڕێکی ڕەهام بە زانین و دەسەڵاتی خودا هەیە ، کە دەسەڵاتی لە هەموو زەمان و شوێنێکدا بە سەر هەموو شتێکدا هەیە . لەمەش زیاتر ئەوەی لەم تەوەرەیەدا قسەی لە سەر ڕوانگەی ئایین و تیۆر قسەی لە سەر دەکرێت شێوەی جوانی ئادەم و ناشرینی شێوەی مرۆڤی نیادرتاڵە!

تەوەرەی دووەم کێشەی لە یەکەم زیاترە . فەرموودەیەك کە بوخاری ڕەحمەتی گێڕابیتەوە چاوەڕێ دەکرێ کە هیچ شرۆڤە و ڕەخنەیەك هەڵنەگرێت !ئەوەی ئیسلامبۆلی لە ڕزگارکردنی عەقڵ لە دەق – بە زمانی عەرەبی –دەیڵێت بەوەی ژمارەیەکی زۆر –کەم نا – لەو فەرموودانەی بوخاری و موسلیم گێڕاوتیەنەوە گوتاری قورئان هەڵدەوەشێننەوە! بۆ نموونە ئەوەی جادووکردن لە پێغەمبەر باس دەکەن ، کە پێچەوانەی عوسمەتبوونی پێغەمبەرە کە لە قورئان باسکراوە!!

ئێمە ئیسلامبۆلی وەك کەس ناناسین و نازانین ئەوەی ئەو باس دەکات لە ڕوانگەی ڕاستکردنەوەی فەرموودەیە بۆ ئەوەی لە گەڵ دەقی قورئان بسازێت یان گومان دروستکردنە لە سەر فەرموودەی گێرایەوەیە لە لایەن بوخاری و موسلیم؟؟

ئەوەی سەد لە سەد ڕاست و دروستە قورئانە ، بۆیە هەر گومانێك لە سەر ڕاستی قورئان دروستکردن ، توێژەر بەرەو مالوێرانی ئەم دنیا و ئەو دنیا دەبات .لەو پێودانگەوە فەرمورودە بە پێوەری قورئان دەپیورێت ، نەك بە پێچەوانە . لەم ڕوانگەوە هەر فەرموودەیەك هەر کێ ڕیوایەتی کردبێت لە گەڵ قورئان پێچەوانە بێت ، قورئان دەکرێتە بنیات ، نەك فەرموودە ! چونکە قورئان لە لایەن خوداوە دابەزیوە و دژوارە بچووکترین هەڵەی تێدا بێت و ڤاڵایە لە هەر هەڵەیەك هەرچی فەرموودەیە بە چەند شرۆڤە داچووە ، بەڵام لە بەر ئەوەی لە لایەن مرۆڤەکانەوە ڕیوایەتکراوە هەڵە یان سەرچیغچوون هەڵدەگرێت .بە واتای فەرموودە وەك قورئان ڕاستیەکی ڕەها هەڵناگرن !

بوخاری تاجی سەر سەرە و لە گەڵ ئەو پیاوەی لێکۆڵینەوەی لە سەر تەمەنی عائیشەی دایکی ئیمانیمان کردووە لەوە هاوبەشن :هەردووك مرۆڤن . کێ ئیمانی لەوی تر زیاترە ئەوە هەر خودا دەیزانێ.من خۆم بچووکترین گومانم لە بوخاری و موسلیم نییە .هەرچی بوخاری دەربارەی هاوسەرگیری پێغەمبەر و عائیشە گووت بێ . گەر ڕاست بێ و لە گەڵ قورئان پێچەوانە نە بێت ، ئەوا عائیشەخان تەمەنی ٩ ساڵ بێ یا ١٨ ساڵ کاتێ شووی بە پێغەمبەر کردووە

هـــیچ لـــە بـــاوەڕی نووســـەر ناگۆڕێـــت ، چـــونکە بـــە ئـــەو هاوسەرگیریە بە فەرمانی خودا بووە

لـە سـەر ئـەو شەنگسـت و بنەمایـە ئـەو بابەتـەم لـە ئینگلیزیـەوە بـە هەنـدێ دەسـکاریەوە وەرگێـڕاوە هـەروەها مەبەسـتێکی دی ئەو وەرگێرانـە بـۆ زیـاتر دەمکـوتی سـیکیولەرانی کـورد بکـەم لـە سەر ئەو مەسەلەیە ، کە زۆر بە ناهەقی دەیوروژێنن.

تـــەوەرەی ســـێیەم تـــا ڕادەیـــەك لـــە تـــەوەرەی یەکـــەم و دووەم جوودایـە ، بـەڵام لـەوەدا لـە گـەڵیان هاوشـێوەیە بـیری سـروش کاریگـەری لـە سـەر سـیکیولەری کـورد هەیـە و حـزوری لـە ڕاگەیانـدنی سـیکیولەری کـوردی هەیـە هـەروەها کـەم و زۆر کاریگـــەری لـــە ســـەر هـــزری هەنـــدێ ئیســـلامی باشـــوری کوردســـتان هەیـــە! ئـــەو ڕۆڵـــەی هـــزری ســـروش لـــە گۆڕەپـــانی ڕۆشـنبیری کوردیـدا کـە پانتایـەکی کـەمی داگیرنـەکردووە، ئـەوە وەی لـە توێـژەر کـردووە کـە شـرۆڤەیەك یـان خوێندنەوەیـەك بـۆ هەنـدێ تێـڕوانینی سـروش بکـات یـان هـەر چ نـەبێ ڕووە شـاراوەکەی هـزری د.سـروش قسـەی لـە سـەر بکـات ، چـونکە ئـەو لایـە بـە مەبەسـت هەوڵـدەدرێت لـە لایـەن سـیکیلەری کـورد جـاری گـووم بکرێـت . وێـڕای ئـەوەش ، لـەم تەوەرەیـەدا هەوڵـدەدرێ ئاماژەیـەك بـۆ هـزری وەرگێرەکـەی سـروش ، ئەحمـەد قەبانچـی ، بکـرێ ، کـە بـە ڕای توێـژەر لـە سـروش

توونـدترە . ئـەو بـە ئاشـكرا قسـە لـە سـەر گوتـاری قورئـان و خودی قورئان دەكات ...

لـەم سـێ تەوەرەیـەدا ، نووسـەر هەوڵـدەدات خـەڵكی ئاسـایی و نائاسـایی ئاگـادار بێـت لـەو كێشـانە . كـە سـیكیولەری و خـەڵكی موسـلمان دروسـتیان كـردووە ئەگـەرنا قورئـان دوورە لە هەر كێشەیەكی هزری و مرۆڤی .

هیـوادارم بۆچـوونەكانم ئامـانجی خۆیـان پێكـابێ ! ئـەوە لـە نـەزەری مـن ئیمـامی شـافیعی وتـەنی ڕاسـتن بـەڵام هەڵـە هەڵـدەگرن ، ڕای ئەوانیـدی هەڵـەن ، بـەڵام دەكـرێ ڕاسـت بـن !جا ئەگـەر بۆچـوونی مـن ڕاسـت بـوون دوعـای خێـرم بـۆ بكـەن ، ئەگەر هەڵەش بوون ، تووڕیان هەڵدەن......



# مرۆڤی نیادرتاڵ
# لە نێوان هەبوون و نەبوونی فیزیکیدا

دەروازە

قسەکردن لە سەر ( یەکەم مرۆڤ ) ئاسان نییە ، چونکە جگە لە بێ باوەڕان لە سەر باوکایەتی ئەو مرۆڤە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی و بوونی بە یەکەم مرۆڤ ، ئەوا لە نێو باوەڕدارانیش ڕای جیاواز هەیە : لە سەر هەبوونی فیزیکی تەنها ئادەم و ئەو بەهەشتەی ئادەم لێبووە ڕای جیاواز هەیە . ئەو ڕا جیاوازییە لە نێو خودی توێژەرانی ئیسلامیش دایە: هەندێک بە بەهەشتی دەزانن وەک نووسەری " مع الانبیاء " و هەندێکی تر تەنیا بە " باخێکی سەر زەوی " وەك ناصری سوبحانی لە " خەلقی ئادەم "دا باوەڕی ئەوهایە و لە گەڵ چەندان نووسەرانی تر .

ئەم نووسینە هەوڵ دەدات لەو مەسەلەیە لە ڕوانگەی دیدێکی تایبەتەوە بکۆڵتەوە و هەروەها ئاماژە بە هەقیقەتی زمانی ئادەم بکات !

نوختەیەکی تر کە جێگای گەنگەشەی هەندێ توێژەری موسڵمانە : ئایا پێش هەبوونی ئادەم " کەسانی گەندەڵ و خوێنڕێژ " لە سەر زەوی هەبوونە؟؟ ئەگەر هەبوونە ، ئەدی چی لە فەرموودەی وەك " کلکم من التراب و ادم من التراب " بکەیین و چۆنی تێبگەیین ، کە پێش هەبوونی ئادەم کەسانی گەندەڵ و خوێنڕێژ هەبووبن؟ !!ئایا ئەوان لە چ ڕەگەزێك بوونە خۆڵ ، ئاگر یان ڕۆناکی ؟ وێڕای ئەمەش ، زۆر خاڵی تر هەن جێگای گفتوگۆن ! هەروەها زۆربەی خاڵەکان بە ئەزموونی سیاسی کوردەوە بەستراونەتەوە !

ئەوەی لەم نووسینە نووسراوە ڕای خۆمە . ئەگەر ڕاست دەرچوو ئەوە دوو چاکەم بۆ دەنووسرێ ئەگەر دروستیش دەرنەچوو ئەوە هەر تەنیا چاکەیەکم بۆ دەنووسرێ ، بەڵام کارەکەم بە هەوڵ و پێکۆڵێك دادەنرێ . لە ڕووی زانستی و شەرعی. ئاساییە لام ، کە قەبووڵ نەکرێ و ڕەتبکرێتەوە ، من خۆم تەواو باوەڕم بەوە هەیە کە هەموو شتێك زادەی زانیاری مرۆڤ ، قابیلی ڕاستبوون و هەڵەبوونە......

لەمێژبوو بە تەمای نووسینێکی لەو بارە بووم ، نەخۆشیە درێژخایەنەکەم مەسەلەی نووسینی کتێبەکەی بۆ نزیك خستمەوە. شانازی بەوە دەکەم زاتی خودا ئەو ڕەحمەتەی لەگەڵ کردم کە نەخۆشیەکەم ببێتە هۆی ئەوەی کە نووسینی لێکۆڵینەوەکەم نزیك ببێتەوە . ئەگەرنا بیرۆکەم لە مێژبوو هەر هەبوو . شەرمم لە زاتی

خودا دەکرد ، کاتێ هەندێ نووسەری سیکیۆلەر بە بێ شەرمانە هەموو سنوورێکیان دەبەزاند . ئێمەش وەك هەندێ مامۆستای زانکۆ دەستمان بە کڵاوی خۆ گرتبوو بای بەرژەوەندی نەیبات !! بە ڕاستی شەرمە هەموو سنوورێکی خودای گەورە ببەزێندرێ ، تۆ وەك مامۆستایەکی زانکۆ ئامادە نەبی بە شێوەیەکی ئەکادیمی و مەدەنی و دوور لە هەموو توندوتیژیەك وەڵامی کەسی نووسەر یان حیزبی بەرانبەر نە دەیەوە!!

هیوادارم لەو بە یەکبەستنەوەی ئەوەی یەکەمجار بە سەر مرۆڤ هاتووە و لەگەڵ مرۆڤی ئێستا سەرکەوتوو بم!

دوو تەوەرەکەی تر تەواو لە یەکەم جوودان . ئەوەندە بە یەکەوە پەیوەستن ، هەر سێ تەوەرە بە کێشەن و گفت و گۆی زیاتریان دەوێت .



## تەوەرەی یەکەم
## مرۆڤی نیادرتاڵ لە نێوان هەبوون و نەبوونی فیزیکیدا

ئێمە باس لە دوو هەقیقەت دەکەین کە هەژموونیان بە زەین و هزرەوە بە سەر مرۆڤی هاوسەردەم هەیە. ئەفسانەی مرۆڤ و وەحی ئیلاهی –وەحی وشەیی نەك ئیلهامی خەیاڵی ، دوو مەسەلەن نەك هەر قسەیان لە بارەوە دەکرێت . بەلکو ئەوەی یەکەم وەك هەقیقەتێکی باوەڕپێکراو گەنگەشەی لە سەر دەکرێت و وەك بوونێکی فیزیکی زانستی مامەلەی لە تەك دەکرێت!!ئەویدیش بە تایبەتی لە تەوەرەی سێیەم قسەی لە سەرەوە دەکرێ : ئایا وەحی نێو قورئان کەلامیە و لە نێوان خودا و پێغەمبەر بەرپابووە یان ئەوەی هەیە تەنها دالْغە و تێڕامانی پێغەمبەرە ، بە واتای وەحیەکە لە زاتی پێغەمبەر تێنەپەڕیووە ! ئەگەر وابێ ، کە وا نییە ، پێغەمبەرایەتی چ مانای دەبێ ؟!

بە ڕاستی ئەو مەسەلەیە ، زانستییە؟؟زانست سەلماندوویوتی ، بەڵگەی هەیە لە سەر هەبوونی ئەو بوونە و کائیناتە ؟ گریمان ئەو کائیناتە خۆی لە بونەوەردا بوونی هەبێت  ئەدی قسەی خودا لە سەر ئافراندنی مرۆڤ بە باشترین شێوە واتای چی دەگەیەنێت؟

یەکەم مرۆڤ –ئادەم–وەك لە تەورات و قورئاندا باسی لێوە کراوە ، ئەگەر لە یەکەم رۆژەوە پێغەمبەر نەبووبێت ، ئەوە لە پاش دەرکردنی لە بەهەشت بۆتە پێغەمبەر و بە شێوەی مرۆڤ بووە و بە هیچ جۆرێك مەیمون نەبووە و پەرەپسەنێت بۆ مرۆڤی ئێستا؟

ئەوانە ئەو پرسیارانەن کە ماوەیەك بە سەر عەقڵی مرۆڤدا سەپێنرابوون بە ناوی زانستەوە . وێڕای ئەوەش هەوڵدەدەیین بە زانستی وەڵامی پرسیارەکان بدەینەوە!

## ئـــــادەم

مەسەلەی ئافراندنی ئادەم زۆر گەنگەشە هەڵدەگرێت. زاتی خودا دەربارەی ئادەم دەفەرموێت : ( ...**اني جاعل في الارض خليفة**.... ) . ئەم دەقە خواییە سێ شتی گرنگ لە خۆ دەگرێ : یەکەم قسەکەر خودایە .ئاخاوتنی ئەو قابیلی ڕەتکردنەوە نییە ، بە واتای لە یەك کاتدا قسەکەر و جێبەجێکەرە .دووەم ئادەم لە "بەهەشت " دروستکراوە . بەڵام لە سەر زەوی خەلیفەی خودایە . زاراوەی خەلیفە زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێت : خەلیفەی ئێستا و ڕابردووە ! ئەگەر خەلیفەی رابردوو و ئێستا بێ ، ئەوا ئەو پێویستی بە هەبوونی کەسانی تر هەیە ، کە حوکمیان بکات . ئەو ڕایە ئیش لە سەر هەبوونی کەسانی پێش ئادەم دەکات ، کە خوێنڕێژ و گەندەڵ بوونە . مەسەلەی هەبوونی مرۆڤی سۆلۆ و نیاردتال مەسەلەیەکە پەیوەندی بە زانستبوونەوە نییە . ئەوەندەی پرسەکە پەیوەندی بە

سیکیۆلاریزم --نادیینی و دنیاگەری وەیە پەیوەندی بە زانستەوە نییە! سێیەم خەلیفە بوون پەیوەندی بە ئاییندەوە هەیە . خەلیفەی خودایە بۆ ئەو مرۆڤانەی لە پشتی ئەو پەیدا دەبن ، بۆ ئەوان دەبێتە خەلیفە و قسە و ئاراستەکانی ئاسمانی لە (بکە) و( نەکەی) بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێت .

## بەهەشتی ئادەم و زەوی

نووسەر و توێژەران لە سەر چەمکی بەهەشتی ئادەم لێبوو یەك ڕا نیین :هەندێکیان باوەڕیان بەوە هەیە ،کە بەهەشتەکەی ئادەمی لێبوو لە گەڵ خودی بەهەشت یەکن . هەندێکیتر بیروڕایان ئەوهایە کە ئەو دووە لە یەك جیاوازن ، بە بێ چوونە نێو درێژدادڕی . نووسەری ئەم چەند دێرە باوەڕی ئەوهایە لە بەر ئەو هۆیانە هەردووك لە یەك جیاوازن:

١. لە بەهەشتی نەمری پاداشت هەیە ، نەك سزا :سزادانی ئادەم و حەوا لە سەر نزیککەوتنەوە لە دارەکە!

٢. ئەوانەی بەهەشت بە دەسدێنن –خۆزگە لە یەکێکیان بین– جارێکی تر نامرن . کەچی ئادەم و حەوا هەردووك مردن!

٣. ئەهریمەن بۆی نییە بچێتە بەهەشتەوە . چونکە بە پێچەوانەوەی ئادەمەوە سوور و ڕژد بوو لە سەر گوناهەکەی و سەرپێچیکردنی خودای گەورە ، کەچی لە سەرگوزشتەی ئادەم و حەوا دەردەکەوێت. بە پێچەوانەی ئەوەی لە تەوراتی جولەکان نووسراوە

. قورئان لە چەند شوێنێك جەخت لە سەر تاوانی یان سەرپێچی فەرمانی خودا لە لایەن ئادەم وحەوا دەکاتەوە ، نەك وەك تەوراتی جوولەکە وابیٚ کە تەنیا حەوا تۆمەتبار بکات و ناویشی بنێت " یەکەم گوناه لە مێژوو دا " یان دەوتریٚ حەوا نەبووایە ئێمەی مرۆڤ هەر لە بەهەشت بووین .....!

٤. کرداری " اهبطوا "هەر بە واتای " دابەزین " لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ شوێنێکی نزم نایەت ، بەلکو بە واتای " گواستنەوە "ش لە هەندیٚ کۆنتێکست –سیاق دێت ، ئەوەتە بۆ گەلی جوولەکە ، قورئان دەفەرمویٚ :" اهبطوا المصر ....." خاڵێکی تر مامۆستای شەهیدی ڕێگای خودا ، کە لە سەر ڕێبازە سوونەکەی و ناسنامە کوردیەکەی دەسەڵاتی ئێران لە سێدارەی دا ، ناصر سوبحانی لە کتێبی " خەلقی ئادەم " دەنووسێت کە : " خوای گەورە لە سورەتی "الحجر" لە سەر زاری شەیتان دەفەرمویٚ: (لازینن لهم في الارض )دەبیٚ ( لە سەر زەوی )دا ژیانی و مەسائیلی وایان بۆ موزەیەن بکەم......تا لە دواییدا گومڕایان بکەم....."لاپەرە ١٨٣

بۆیە دەکریٚ ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەوای لێبوونە ، بەهەشتی نەمری نەبێت ، بەلکو چۆن "الجنة " لە هەندیٚ سیاق بە تایبەتی لە سورەتی الکهف بە واتای " باخچە –باخ" هاتووە ، لەوێش مەبەستی خودای گەورە هەر باخچەیەکی گەورە بیٚ ، نەك خودی بەهەشت !

وەك ڕا یان زەن توێـژەر بـاوەڕی وایـە ، کـە ئـە بەهەشتەی ئـادەمی لێبـووە ، باخێـك لـە باخـەکانی سـەر زەوی بـووە ، بـەڵام خـودی بەهەشت بێ ، ئەوا نووسەر ئامادەیە ڕای خۆی بگۆڕێت .

زمانی خودا و ئادەم چی بووە؟؟

پرسی یەکەم زمان ماوەیـەك لـە سـەدەی نۆزدەم و بیستەم مێشکی مرۆڤی ئەوسای جەنجاڵ کرد بوو هـەتا زۆربەی جار پرسەکەی لـە سـنوور و چوارچـێوەی زماننـاسـی بـرد بـووە دەرەوە بـەرەو ڕەگەزپەرستی سەرکێشی دەکرد!

دەیڤید کریستال لە کتێبی زمانناسی دا ئاماژە بەو هەوڵانە دەکات ، کە دەربارەی زمـانی ئاخـاوتنی نێـوان زاتـی خـودا و ئـادەم دواون! هەندێك بە تەوسەوە لـە زمـانی نێوان زاتـی خـودا و ئـادەم قسـەیان کردووە و دەڵێن خودا بە زمانێك و ئادەم بە زمانێکی جودا لـە هـی ئەو و مارەکە بە زمانێکی جودا لە هەردووکیان قسەی کـردووە! ئەو زمـان لـە یەکجوودایـە بێجگـە لـەوەی دروسـت نییـە و جیـاوازە لـە لۆژیکی دروست ، چونکە ئەنجام لە بوونی زمان بە تایبـەتی یـەك لـە نێـوان ئـاخێوەر –خـودا و وەرگـر –ئـادەم – دایـەلۆك لـە یەکترگەیشتنە، نەك هەر یەکەی لە ئاوازێك بخوێنێت !!

زۆر شتی تر دەربارەی جۆری زمانەکە قسەی لە سەر دەکرێ :یـەکێ دەڵـێ زمـانی خـودا ئیسـپانی ، سـوێدی ، ئینگلیـزی ،

فەرەنسی..... بووە ، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی ئاسمانی یان ئەرکیۆلۆژی دووپاتی هیچ لەو ڕایانە ناکات.ئەوەی ئێمە دەمانەوێ جەختی لە سەر بکەیین لە خوارەوە ، دروستبوونی ڕەگەزپەسندیە لە وروژاندنی ئەو مەسەلەیە. ئەلمانەکان لە ڕێگای پارتەکەی ئەدۆلف هیتلەر پێیان وایە ڕەگەزی ئاری لە سەر هەموو ڕەگەزێکی تر پەسند تر و شایەن ترە حوکمی دنیا بکات! ئەوە لەوە سەرچاوەی گرتووە ، کە ئەلمانەکان لە هەموو ڕەگەزێکی تر لە لای خودا پەسند ترن ، چونکە گەلی ئاری بەشداری نەکردووە لە بونیاتنانی تاوەری بابل بۆ بەگژاداچوونی زاتی خودا ، هەربۆیە وا چاوەڕێ دەکرێ کە خودا بە زمانی ئەلمانی قسەی لە گەڵ ئادەم کردبێت و لە ئاکامدا زمانی ئەلمانی " یەکەم زمان " بوو بێ!هەروەها ئەفسانەیەکی دی دەهێننەوە . گوایە ڕەگەزی ئەلمان بەشداری نە کردووە لە بونیاتنانی " تاوەری بابل " بۆ بەرەنگارکردنی خودا ، بۆیە ئەلمانی یەکەم زمانە!!

لە سەر ئەو شەنگستە ئەفسانەیدا ، کەسانی وەکو هیتلەر چ مەرگەساتێکیان بە سەر مرۆڤایەتی هێنا! ئەگەر قسە لە سەر هەڵبژاردن بکەین و ئەنجامەکەی بە پێوەر دابنێیین ، ئەوا پارتەکەی ئەدۆلف هیتلەر بە هەڵبژاردن هاتە سەر کورسی دەسەڵات!کارل پۆپەر زۆر دژی شیوعیەکان بوو . بۆیە لە کۆمەڵگای کراوە دەڵێت :" لە پێناو مرۆڤایەتی نابێ بە ئەنجامی هەڵبژاردن ڕازی بیین ، چونکە ئەو شیوعیانە مەرگەسات بە سەر ئەو کەسانە دەینن ، کە

شیوعی نیین " ئێمە هەر لە تەمەنی خۆماندا بەشێك لە دەسەڵاتی شیوعیەتمان بینی کە چیان بە سەر یەکێتی سۆڤیەت و ئەوروپای ڕۆژهەڵات و بەشێك لە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین هێنا ، دەبێ پاش نەمانی یان ڕوخانی جارێکی تر زیندووی بکەینەوە ، ئەگەر بەدیلی شیوعیەت لە بەرگێکی گەندەلی تر دابن!! لە تەوراتی جولەکە-نەك تەوراتی ئاسمانی- و کتێبە جولەکەیاکانی تر ، کەسانی جولەکە گریمانی ئەوە دەکەن ، کە زمانی خودا لە گەڵ ئادەم عیبری بووە! بۆ ئەوەی ئەو گریمانەی جولەکە بێتە دی ، چەندەها ئەزموونیان سازکرد بۆ ئەوەی بسەلمێنن کە ئەو زمانەی خودا قسەی پێکردووە زمانی عیبری جولەکە بووە!! لە پەنای ئەو ئەفسانەی جولەکەدا نەك هەر زمانی جولەکە بۆتە زمانی یەکەمی مرۆڤایەتی ، بەلکو وەك قورئان دەفەرموێ : " ئەوان خۆیان بە گەلی هەلبژاردەی خودا دادەنا " ! کەچی هیچ ئامادە نەبوون بەرگری لە دەسەلاتی خودای موسا بکەن!! لە سەر ئەو دوو بنەمایە لە " وعد بلفۆر و پەیمانی سیڤەر " ڕۆژئاوای " مەسیحی " دەوڵەتێکی بۆ جولەکە لە فەلەستین جاردا و بە کردەوەش هەر لەو وڵاتە لە ١٩٤٨ دەوڵەتێکی جولەکە لە بەشێك خاکی فەلەستین دامەزرا!! هیچ دەقێکی ئیلاهی یان مرۆڤی سەلیم ئەوە ناسەلمێنێت کە زمانی خودا زمانی ئەلمانی یان عیبری بێ ، ئەوەی دەگوترێ و دەنووسرێ لە سنووری زەن و خەملاندن دەرناچێت ، هەر بابەتێکی زانستی بە زەن بەڕێوە ناچێت!!

ئێزیدیەکانی لای خۆمان ، کە لە ئەنجامی شەڕ و ململانێی ئەمەوی و عەباسی دروستبوونە و مێژووی دەرکەوتنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یازدە و دوازدەی میلادی ، نەك بەشێك بن لە پاشماوەی زەردەشتیەتی یان میسرائی !! ئەوانە وا گریمان دەکەن : " ئەهریمەن کە ئەوان پێی دەڵێن " مەلیك تاوس " بە زمانی کوردی شێوەی کورمانجی قسەی لە گەڵ خودا کردووە ، کەواتە زمانی کوردی یەکەم زمانە " هەروەها ئەوەش دەکەنە بەڵگە ، کە هەموو سروتەکانیان –تقوسەکانیان– بە زمانی کوردیە !

لە بەهەشتەکە–باخی ئادەم لێبوو– جگە لە زاتی خودا سێ بوون ڕۆڵیان هەیە لە سەر چارەنووسی تاکەکان ! فریشتە یان مەلائیکەت لە لای خودا وا دروستکراون و پرۆگرامکراون کە تەنیا ئەوە بزانن کە خودا فێریاندەکات و هیچ تر زیاتر نەزانێت!! لەمەش زیاتر ، ئەو ماددەیەی لێوە خەڵقکراوە لە گەڵ مرۆڤ و جنۆکە جودایە! فریشتە لە ڕۆناکی دروستکراوە وا پرۆگرامکراوە کە هەرگیز هەڵە نەکات ! هەرچی جنۆکەیە لە ئاگر دروستکراوە و وا پرۆگرامکراوە کە هەڵە و ڕاست بکات . ئەهریمەن خۆی جنۆکەیە و لە ئاگر دروستکراوە و بە فەرمانی خودا ڕازی نەبووە و سوژدەی ڕێزی بۆ ئادەم نەبردووە . ئێزدیەکان لێرەدا دوو جار بە هەڵە چوونە بەوەی دەڵێن : مەلیك تاوس ڕاست بووە بەوەی کرنۆشی بۆ غە یری خودا نە بردووە ، چونکە نابێ کرنۆش جگە لە خوا بۆ کەسیتر ببەین ، دووەمیش بە هەڵە لەو جۆرە " سوژدەیە "ی لە قورئان هاتووە گەیشتوون ،

قورئـــان لێـــرە مەبەســـتی ســـوژدەی ڕێـــزە نـــەك ســـوژدەی پەرستن!!!هەرچی سێیەمە ،کە بە قەد تەبەقەی ئاسمان لە حەوت قۆناغ لە خۆڵ دروستکراوە و وا پرۆگرامکراوە کە چاکە و غەڵەت بکات ، بەڵام لەوەدا لە غەڵەتی ئەهریمەن جیا دەکرێتەوە ، کە وەك ئادەم لە غەڵەتی خۆی پەشیمان دەبێتەوە!!!

کتێبی پیرۆزی ئەوان ؛ کە جیلوە و مەسحەفا ڕەش و قەوڵی ئێزدیانە . جیلوە و مەسحەفا ڕەش بە بنزاری سۆرانییە و بە خۆشیان بە کرمانجی سەروو قسە دەکەن و لەمەش زیاتر ڕۆژهەڵاتناسێك دۆزیتیەوە.

هەندێ لە عەرەبەکانی عێراق و دەرەوەی هەموو سنوورێك دەبەزێنن و بە زاری پێغەمبەر وتەیەکی هێندە سەیر دەڵێن " لە بەر سێ شت عەرەبتان خۆشبوێت من عەرەبم . زمانی بەهەشتیەکان عەرەبیە . زمانی قورئان عەرەبیە " "ئیسلام بە زەلیلی عەرەب زەلیل دەبێ " بە هیچ جۆرێ زمانی بەهەشتیەکان عەرەبی نییە ، لە ڕۆژی دوایی خودا بە بێ هەبوونی هیچ تەرجومانێك قسە لە تاکە زمان جیاوازەکان دەکات . جودایی لە زمانەکان ئایەتێکی خودای گەورەیە ، بۆیە ئەوانەی غەیرە عەرەبن چۆن لە زمانی خودا بگەن!هەرچەندە خودای گەورە نەتەوەی جیاواز و زمانی جیاوازی بە ئایەتێکی خۆی زانیوە . بەڵام ئەوانەی لە ژێر سایەی ئەودا نیین

. مەسەلەی عەرەبوونیان وەکو ئەبو جەهل و ئەبو لەهب ...لەپێش موسلمانبوونیان دادەنێن و ناتوانن قەبوڵی غەیرە عەرەب بکەن!!

مەسەلەی بوونی غەیرە عەرەب زمانی غەیرە عەرەبی لە جیهانی عەرەبی ، ڕەگەز پەرستی لای عەرەب دروست دەکات! عەرەبی عێراق و سوریا قەبوڵی ئەوە ناکەن کە کورد وەك نەتەوەیەك بناسن!کەچی خودا وەك نەتەوەیەك –کۆمەڵە کەسێك–کە زمان و ڕەگەزی جیاواز لە عەرەبیان هەیە ، دەیناسی و بە بێ هەبوونی تەرجومان قسەیان لە گەڵ دەکات .

کۆمەڵەی زماننناسی فەرەنسی هەر لە بەرایی سەرهەڵدانی ئەو پرسە، ئەو پرسەی بە نازانستی دانا بڕیاریدا چیتر ئەو پرسە لە نێو پرسەکانی زماننناسی شرۆڤە نەکات...

لەم ڕوانگەوە پرسی زمانی یەکەم یان ئەو زمانەی زاتی خودا و ئادەم قسەیان پێکردووە بە لاوە بنرێت!!هەرچی بوونی عەرەبە لە جیهانی ئیسلامیدا ڕێژەیەکی کەمە ، لە وڵاتێکی وەکو ئەندەنوسیا کە لە ڕێگای بازرگانیەوە نەك جەنگەوە بوونەتە موسلمان هەر بە تەنیا ڕێژەییان لە عەرەب زیاترە زۆربەشی سوونە مەزهەبن نەوەك وەکو عەرەب سوونە و شیعە و فەلە و جولەکە و ..........بن ، بۆیە بە زەلیلی عەرەب ئیسلام زەلیل نابێت ، ئەوەی عومرە یان حەجی کرد بێت دەزانێ ، ئەم ئایینە جیهانیە و عەرەب تەنها ڕێژەیەکی کەمی ئەم دینە پێکدەهێنێت!!!

لەو سێیەدا –فریشتە ، جنۆکە ، مرۆڤ –ئادەمیزاد ، کە هەر سێ خودا لە ڕەگەزی جیاواز خەڵقی کردوون : ڕۆناکی ، ئاگر ، خۆڵ ، مرۆڤ هەرچەندە دەسەڵاتی ئەو دووەی پێشووتری کەمترە ، بەڵام لە لای خودا وا پرۆگرامکراوە " ناوی هەموو شتێك لە بوونەوەر بزانێت " :" **و علم ادم الاسماء کلها** ...." کەچی ئەوانی تر (فریشتە و جنۆکە ) ئەو شتەیان نە دەزانی!! لە بارەی توانای وەرگرتن acquiring language و فێربوونی زمان learning ، نۆوم چومسکی دەڵێت : تەنیا لە مێشکی مرۆڤدا ( لە نێو مەخلوقە بینراوەکاندا ) ئامێری وەرگرتنی زمان هەیە . توێژەرێکی بیانی دەڵێت : ئەو ئامێرە وەك مرۆڤ وایە لەگەڵ تەمەن پیر دەبێ و دەسەڵاتی کەم دەبێ ، بە واتای لە منداڵ زۆر چالاکترە وەك لە پیرە مێردێك . کاتێك خودا ویستی دەسەڵاتی فریشتە و جنۆکە بەرانبەر مرۆڤ تاقی بکاتەوە ، مەسەلەی زمانی هێنا گۆڕێ ، فریشتە و جنۆکە بەرانبەر ئەو پرسە دەستەوەسان بوون!!

لێرەدا دەمانەوێ ئامارە بەوە بکەین هەروەك چۆن زمان خەڵاتی خودایە و داهێنانی مرۆڤ نییە ، ئەوا ئەلفبێش هەر خەڵاتی خودایە لە سەر ئەو بنەمایانە:

کاتێك موسا پێغەمبەر چووە کێوی **الطور** بۆ دیدەنی زاتی خودا و چل ڕۆژ مایەوە خودا نۆ ئایەتی پێدا " ئەو نۆ ئایەتە لە لەوحە نووسرابوون " . موسا لە گەشتەکەیدا بە تەنیا بوو ، لە ئاسمانەوە

ئەو نۆ ئایەتەی وەك وەحی بۆ هات ، وەحی خوداش بۆ پێغەمبەران وشە –کەلامە !ئایا زمانی ئەو نۆ ئایەتە چی بوو؟؟ ئەلفبێ یەکە لە ئاسمان دانرا بوو یان موسا .....؟ ئەو لەوحە و ئەلفبێ یە لە کوێ هاتن ئەگەر لە تەرەف زاتی خودا نە هات بن؟! ئەو پیتانەی لە سەرەتای هەندێ سورەت هەن : لە ئاسمان دابەزیون . نەك داهێنانی مرۆڤ بن؟؟!!

بە کورتی گومان دەبردرێ کە زمان و ئەلفبێ خودایی بن.زمانی خودا و ئادەم چ زمانێ بووە نەزانراوە!ناشزانرێ ، چونکە نە هیچ مرۆڤی ئەو سەردەمە ماوە تاکو مەسەلەکە ساخ بکەیینەوە هەروەها هیچ پاشماوەیەکی ئەرکیۆلۆژی بوونی نییە و هەروەها ئەو قسەیەی دەوترێ کە دەنگی مرۆڤ لە سنووری گەردوون تێناپەڕێت و دەکرێ لە ئایندە کۆیان بکەینەوە!! بەڵام هێشتا ئەو ئایندە نە دۆزراوەتەوە!!

انا خیر منه

ئەم وتەیە بە قەد خەڵقکردنی مرۆڤ–بەنی ئادەم کۆنە ! خوای گەورە لە قورئان پێمان دەڵێ ئەوە قسەی ئەهریمەنە –شەیتانە . ئەو قسەیە گەرچی لە سێ وشە پێکدێ ، بەڵام واتایەکی گەورە لە خۆ دەگرێت و مەرگەسات بۆخودی بەنی ئادەم دەخوازێت. ئەهریمەن

نەك هەر بە بوونی فیزیکی ئادەم ڕازی نە بووە ، بەڵام ئامادە بوو هـەر دەسـەڵات و خۆشـیەکی هەمیشـەیی بـە قوربـانی ئـەو دوژمنکاریـەی لـە گـەڵ ئادەم بکات و خـوای گـەورەش لـە ژیـانی هەمیشـەیی دووریخسـتەوە . ئەمـە مەسـەلەیەکە زۆربـەی موسلمانەکان دەیزانن. ئێمەش هیچ لە سەر ئەو مەسەلەیەوە قسە ناکەین....

ئەوەی ئێمە قسەی لە سەر دەکەیین ، ڕەنگە هەندێکی نوێ بێ سەبارەت بە هەندێ کەسەوە!

یەکەم مرۆڤ خۆی دوور بگرێ لە زۆر بە کارهێنانی ڕاناوی " انا و نحن -من و ئێمە " لە کاتی قسەکردن لە سەر پەرستشەکان .ئەوە خـودی شـەیتان ڕانـاوی " انـا -مـن "ی بـە کارهێنـاوە و بـەو بەکارهێنانە چی لە خۆی و بەنی ئادەم کرد!!

دووەم مرۆڤ خۆی دووربگرێ لە بە کارهێنانی ڕاناوی " نحن-ئێمە " وەك دەسـەڵاتدارانی چـواردەورەی بەلقیسـە خـان ، ئەگـەر بەلقیسەخان بە گوێی ئەوانی بکربووایە ، ئەنجامی باش نەدەبوو.

سێیەم ئەو ڕاناوانە -من و ئێمە- تایبەتن بە دەسەڵاتی خوای گەورە . نابێ ئەوەی مرۆڤ و جنۆکەیە هەر دەسەڵاتێکی هەبێ ، نابێ لێی نزیك ببێتەوە...

ئەوەی ناونیشانەکە وا مان لیّ دەکات زیاتر لیّی بدوێین دیاردەی ڕەگەزپەرستییە!

ڕەگەزپەرستی یان ڕەسیزم racism لە سەر چ بنیات و بنەمایەك دروست دەبیّ؟؟ ئایا ئەو نەتەوەیەی مومارەسەی رەسیزم بەرانبەر نەتەوەیەکی تر دەکات ناچێتەی خانەی شەیتانپەرستی یان شەیتانئاسایی؟؟ ئەو نەتەوەیەی علمی یەقینی لایە ، کە ئەو کارە دەکات ، دەبیّ بە خۆی دابچێتەوە کە شتێکی زۆر گەورە دەکات و وەختی خۆی شەیتان لە سەر ئەو رەگەزپەسندیە لە " بەهەشت " دەرکرا!!

کێشەی شەیتان لە گەڵ ئادەمدا تەنیا لە سەر ڕەگەزپەسندی بوو هەروەك خۆی لە قورئان دەڵێت :" من لە ئەو چاکترم ....ئەوت لە خۆڵ دروستکردووە ، بەڵام منت لە ئاگر دروست کردووە ..." ئەو نەتەوانەی خاکی کوردستانیان داگیرکردووە و بانگەشەی موسلمانبوون دەکەن درۆ لە گەڵ خۆیان دەکەن ، ئەگەرنا باش دەزانن نە خودای گەورە بەو داگیرکردنە ڕازییە نە کوردستان وڵاتی ئەوانە و دەبێتە هی ئەوان !! تورك و فارس و عەرەب لە گەڵ کورد " هاوڕەگەزن " نە ئەوان لە ڕەگەزی ئاگر دروستکراون و کوردیش لە خۆڵ ! هەر چوار لا لە سەر هەمان ئایینن و لە گەڵ تورك و زۆربەی عەرەبەکان " هاومەزهەبە "!!! هەر تاکێکی تورك و فارس و عەرەب دیندار و بێدین دەزانێت ئەوەی دەسەڵاتی تورك و فارس و عەرەب

دەیکات ڕەگەز پەسندییە و بەو کارەشیان دەبنە هەڤاڵی شەیتان !!تا ئێستا خۆپیشاندانێکی تورکی و فارسی و عەرەبیمان بینیووە داوای ماف بۆ کورد بکەن!!! کە لەگەڵ ئەوان هاودین و هاومەزهەبە؟؟ ئەوەی ئێستا پێی دەگوترێ " جێناکۆکەکان " عەرەبی سوونە و شیعە نازانن ئەمە خاکی کوردە؟؟ئەو ناوچانەی بە نیسبەت دەسەڵاتی کوردەوە بە " جێناکۆك " ناوزەد دەکرێن ! لە ڕاستیدا ئەوانە جێناکۆك نین ، بەلکو دابڕاون ! ئەوا گریمان هێزی کوردی ساڵی ٢٠٠٣ خەریکی تالان و بڕۆ نەبووایە مژۆڵی ڕزگارکردنی ئەو شوێنانە بووایە . ئێستا سەبارەت بە عەرەبی هاوردە و تورکمانی ناو بەرە نەك کورد ، ناوچەی جێناکۆك دەبوون!!

بە ڕاستی ئەگەر ئەو نەتەوانە بیانەوێ لە ڕواڵەت ئادەمی بن لە ناوەوە سیفەت شەیتان بن ، با بە خۆیان دابچنەوە!!!

لە کۆمەڵگەی ئیسلامی دیندار و مەسیحی هاولاتی یەك ولاتن و ئینتمایان بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوای ولات هەیە . بەڵام ئەگەر هەردوو هاولاتی ولات ( عەرەب و کورد ) و (تورك و کورد ) و (فارس و کورد ) موسلمان بوون ، ئەوا هەر دوو لا چاوەڕێ دەکرێ وەك " برای ئیمانی " بژیین ، چونکە ئەوە لە ئایەتێکی خوای گەورە سەرچاوەی گرتووە : " ئیماندار برانە _ **انما المئمون اخوة** "، ئایا تورك و فارس و عەرەب، کە سەبارەت بە کورد ئیستعماری لۆکەڵن ،

کورد بە مەسیحی حیساب دەکەن تا بە موسلمان حیسابی بکەن هەتا وەك هاوڵاتی لە وڵاتی خۆی مامەڵەی لە گەڵ بکەن ؟؟؟ ئێمە بێجگە لە داوای " برایەتی ئیمانداری " زیاتر داوا ناکەین- ئەگەرچی مافی خۆمانە دەوڵەتی سەربەخۆ داوا بکەین ، چونکە ئیسلامی . قەومیی ، مارکسیی ئەو نەتەوانە باوەڕیان بە مافی کورد لە سەر خاکی خۆی نییە!! جا چۆن باوەڕیان بەو مافە ئیمانییە هەیە؟؟!!

هەتا کەی ئێمە بە دروستی بیر نەکەیینەوە ، ئەوا شەیتان ڕەگەزی لە گەڵ ئێمەی بەنی ئادەم جودایە شەڕ لە گەڵ ئێمە دەکات . خواش دەفەرموێ " کە شەیتان دوژمنتانە و بە دوژمنی بزانن " ، ئایا تورك و فارس و عەرەب لە گەڵ ئێمەی کورد هاو ڕەگەزن . بۆ دوژمنایەتیمان دەکەن؟؟؟ دەبێ ئەوان یان ئێمە خۆمان بە ڕەگەزی شەیتان بزانیین ، بۆیە نابێ شەڕی یەکتر بکەیین ، گەر لایەك نەوەی شەیتان نەبێ ؟؟!!!

### ئادەم و قەدەر

ئادەم زۆر ئاستەنگ و لەمپەری لە پێش بوو . بەر لەوەی بچێتە بەهەشتەکەی خۆی . خودای گەورە بە مەلائیکەکان دەفەرموێ :" و اذ قال ربك للملئيكة اني جاعل في الارض خليفة ...." ( من جێنشینەکی خۆم لە سەر زەوی دادەنێم ) ، خوا دەفەرموێ : " لە سەر زەوی..." نەك " لە ناو بەهەشت..." جێنشینەکی خۆم دادەنێم "

کە فریشتەکان لە سەر ئەو فەرمانەی خوا بە جواب دێن و دەڵێن :" ا تجعل فيها من يفسد فيها و يسفك الدماء...." البقره -٣٠ خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە بەوەی :" انی اعلم ما لا تعلمون – ئەوەی من دەزانم ئێوە نایزانن " هەر لە گفتوگۆیەی نێوان خوا و مەلائیکەکان دەردەکەوێ مەلائیکەکان وا زەن بە غەیری خۆیان بەرانبەر خوا دەبەن " کە گەندەڵ و خوێنرێژ دەبن "! بەڵام کاتێ ئادەمی لە قوڕی سورکراوە دروستکراو بە فەرمانی خوا بە قسە دێت و دەردەکەوێت عیلمی زیاترە لە مەلائیکەکان ، ئەوسا مەلائیکەکان وەك شەیتان ناکەن و بە چۆکا دێن و دەڵێن : " لا علم لنا الا ما علمتنا..." لێرە دەردەکەوێ کە مەلائیکە جیاواز لە ئادەمیزاد وا پرۆگرامکراوە هەر ئەوەندە بزانێت ، کە خودا فێری کردووە ! بە واتای مەلائیکەکان نەیاندەزانی ، کە ئادەم ناوی هەموو شتەکان دەزانێت.

ئەو گەندەڵی ئیداری و سیاسی و ئابووریەی ئادەمیزادی پێتۆمەتبار دەکرێت لە لایەن مەلائیکەکان وە ، چونکە وەك گوتمان مرۆڤ ئەوها ئافراندراوە کە ئیرادەی ئازاد بێ و ڕاست و هەڵە بکات . ئەو تۆمەتانە باسی ئایندە دەکەن ، نەك ڕابردوو . ئەو قسانەشمان لە سەر ئەو بنەمایانە گوتووە:

١. خودای گەورە وا مەلائیکەی دروستکردووە ئەوەندە بزانێ کە خوا فێری کردووە هەروەك ئایەتەکەی سورەی بەقەرە ئاماژەی پێدەکات.
٢. جنۆکە پێش مرۆڤ دروستکراوە ، هەر ئەوانیش وەك مرۆڤ چاك و خراپە دەکەن ، هەر ئەوانیش لە سەر زەوی بوونە!
٣. ئێمەی مرۆڤ لە ئادەم وەپاش کەوتووین ، ئادەمیش لە خۆڵی سەر زەوی دروستکراوە ، کەواتە ئێمە تەنیا نەوەی ئادەمین ، نەك مرۆڤی نیادرتاڵ.خوای گەورە لە دەقێکدا دەفەرموێ "...و صورکم فاحسن صورکم..التغابن . ئەوەی خودا جەختی لە سەر دەکات " باشترین وێنە یە " هەرچی ئەوانەی باوەڕ بە تیۆری پەرەسەندن دەکەن " ناشرینترین وێنەی مرۆڤە ، ئەویش مرۆڤی نیادرتاڵە!
٤. چیرۆکی هەبوونی مرۆڤی تر پێش ئادەم زیاتر لە ئەفسانە دەچێت!

زانینی خوا لە سەر ئەوەی کە مرۆڤ لە سەر زەوی نەك بەهەشت خەلیفەی خوا یە ! بە واتای خوا( دەیزانی) ئادەم و حەوا ئەو دارە قەدەغەکراوە( تام) دەکەن بە قسەی شەیتان ( دوای سوێند خواردنی بە خوا ) لەو بەهەشتەی لێیبوون ، دەسەڵاتی خوا وای لێ نەکردن کە دارەکە تام بکەن ، بەلکو خۆیان ئازادبوون ، کە بە قسەی شەیتان بکەن یا نەء؟ ئەوان بە دەسەڵاتی عەقڵی خۆیان بە قسە هەنگوینیەکانی شەیتان فریویان خوارد و خۆیان ( فەرمانی خوایان) شکاند و

شەیتانیان بە دوژمن نە زانی ، کە خوا داوای لێکردبوون لەو دارە نزیک نەبنەوە! لەو چیرۆکە ڕاستیەدا دەگەینە ئەو ئەنجامە: کە مرۆڤ کاتێ بێ ئەمری خودا دەکات لە جل و بەرگ ڕووت دەبتەوە! جا وا گومان دەبەم هەرچی جلی نیوە-ڕووت لە بەر دەکەن، بێ ئەمری خودا دەکەن.

## ئادەمی مرۆڤ و ئادەمی پێغەمبەر

ئەم ئایینە ئەوهایە کە هیچ نەتەوەیەك بچووك یان گەورە پشتگوێ نەخات بۆ هەر نەتەوەیەك ڕزگارکەرێکی – پێغەمبەرێکی بە زمانی قەومەکەی و لە ناو قەومەکەی بۆ ناردووە !وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ : " لکل قوم هاد" یان لە شوێنێکی تر لە قورئان دەفەرموێ : " نەتەوە نییە پێغەمبەری یان ترسێنەری بۆ نەناردرا بێ " بە زمانی میللەتەکەی بۆ ئەوەی ئەو پەیامەی بۆ هاتووە بۆ ئەوان ڕوونبکاتەوە "–سورەتی ئیبراهیم .بەوەی خوا لە دەقێکی قورئان دەفەرموێ :" ئێوەی مرۆڤم قۆناغ بە قۆناغ دروست کردووە " ، ئەو وشەی " اطوار "ە مەبەست لێی قۆناغەکانی خەڵقی ئادەمە ، چونکە ئێمە هەموو لە ئادەم دروست بووین؛ نەك لە بوونێکی تر دروست بووبین و ببین بە مرۆڤ!!

ئادەمی مرۆڤ بە حەوت قۆناغ دروستکراوە:

١. ئادەم لە خۆڵ یان خاك دروستكراوە :" كلكم من ادم و ادم من تراب"
٢. قوڕ ، ئاو و خۆڵ ( **من طين**... )
٣. **قوڕی بەر هەتاو ( طين لازب )**
٤. قوڕی داغكراو لە فرنی ( **من صلصال** )
٥. قوڕی ناو بۆشی توندوتۆڵ ( **من حمأ مسنون** )
٦. قوڕی وشكراوە ( **من صلصال كالفخار** )
٧. روح تێكراو-مرۆڤی ئاسایی ( و نفخت فيه من روحی فقعوا له ساجدين )-حاجی كاروان ، ژیانی پێغەمبەران ل٤٠.

لەوانەیە پێشنیازی چ سیستەمێك بكەیین هەر یەك تەبەقەی ئاسمان بە چ سیستەمێك كاردەكات ، خودای گەورە لە ماوەی شەش ڕۆژدا بێ ماندوو بوون و یارمەتی كەس حەوت تەبەقەی ئاسمانی ،هەر یەكەی بە قەبارەیەكی جیاواز ، دروستكرد و ئەوی تێیاندایە خستیە بەر ڕاژەی مرۆڤ ...

هەروەها هەندێ نووسەری موسلمان دەڵێن ئەو ئایەتەی دەڵێت :" ئێوەمان قۆناغ بە قۆناغ دروستكردووە " مەبەست لێی قۆناغەكانی دروستبوونی كۆرپەلەیە لە ناو سكی دایكی . ئەو قۆناغانەی كۆرپەلەی پێیدا تێپەڕ دەبێت زۆر زانای ڕۆژئاوای ناچار كردووە ، كە دان بەوە بنێن كە قورئان لە

تـەرەف خـوداوە دابـەزیووە .لێـرەدا گرنگـە ئامـەژە بـە بەشـیَ لـە دوا ئایـــەتی ســـورەتی لقمـــان بکـــەین کـــە قســـە لـــە شـــتە پەنهانـــەکانی دنیـا دەکـات ، دوو لەمانـە جێگـەی گەنگشـەن لـە لایـەن سـیکیولەرانی کـورد : مەسـەلەی باران و زانـینی زایەنـدی کۆرپەلەیە بە ئامێری سۆنەر ؟؟

بـاران بـارین یـەکیَ لـە پرۆسـانەیە کـە لـە چوارچـێوەی تـەنیا زانـینی خودایـە . بـۆ ئـەوەی زیـاتر لەمـە بگـەیین : ئەوانـەی لـە بـواری فەلـەکزانی کـار دەکـەن نـاتوانن خشـتەیەك بـۆ تـەنیا مانگێـك نـەك سـاڵێك دابنـێن کـە بڵـێن فلانـە ڕۆژ بـاران دەبـاریَ . بـەلاّم هـەر خـوا دەزانـیَ لـە چ وەختـەکی سـاڵ هـاوین ، پـایز ، زسـتان ، بـەهار بـاران دەبـاریَ هـەروەها لـە چ ڕۆژێـك شـەممە ، یـەك شـەممە....لە چ چـرکەیەك. ئەوانـە هـیچ کەسـیَ نـازانیَ .هەنـدیَ جـار هـەورێکی ڕەش لـە ئاسمانـە و موجـەب و سـالیب لـە یـەك نزیـك دەبنـەوە ، بـەلاّم بـاران نابـاریَ!!زانینی خـودا نەوهایـە کـە ژن لـە چ چـرکەیەك و سـەعات و مـانگیَ زگـی دەبـیَ ، هـەروەها لـە یەکـەم ڕۆژی سـکبوونی ئافرەتـەوە زاتـی خـودا دەزانـیَ کـوڕە یـان کـچ هـەروەها دەزانێـت لـە چ چـرکەیەك ڕۆژێـك دەمـریَ ، ئـەوجا مـرۆڤ بـە هـیچ جـۆریَ لـە ڕۆژی یەکـەم و مـانگی یەکەم....نـەك سـونەر بـە هـیچ ئامێرێـك نـاتوانیَ ڕەگـەزی کۆرپەلەکـە دیـاری بکات!!ئـەو کاتـەی سـونەر دەتـوانی ڕەگـەزی کۆرپەلەکـە دیـاری بکـات کۆرپەلەکـە و تـۆی مـرۆڤ وەك یـەکن !

تـۆ گیانـت هەیـە ، ئـەویش گیـانی هەیـە !ئەوانـەی زۆر بـە ڕۆژئـاوا سەرسـامن ، دەبووایـە پرسـیاری ئـەوەیان لـە ڕۆژئـاوا بکردایـە کـە چـۆن لـە سـەردەمی تـەکنۆلۆژیای سـەردەم ئـەوان وەك عەرەبـەکانی پـێش موسـلمانبوون کۆرپـە ناشـەرعیەکان لـە نـاو سکی دایکیـان لـە نـاو دەبـەن ! ئایا ئەمە مرۆڤکوشتن نییـە ؟! ئایـا محەمـەد قوتـب هـەقی نـە بـوو ئـەو پرۆسـەیە بـە جاهیلیـەتی سـەردەم یـان نـویێ نـاو بنـێ ؟ زینـدە بە چـاڵکردنی کـچ لـە گـەڵ کوشـتنی زارۆکـی نـاو سـك یـان دەرەوەی سـك چ جیاوازیەکی هەیە ؟ هەردووك هەر زارۆك کوشتن نیین ؟؟!

ئێسـتا زانیـت ئەوانـە تـەنها لـە زانـینی خـودا دان ، مـرۆڤ بـەو زانینـە کەمـەی لـە لایـەن خـوداوە پێیـدراوە ، قـەت و قـەت ناتوانێ ئەو پەنهانیانەی خودا بدۆزێتەوە.

## ئادەمی پێغەمبەر

هەرچـەندە هـیچ دەقێـك نییـە بـە ئاشـکرا وەك پێغەمبـەرەکانی تـر( ئـەوەی لـە قورئـان ناویـان هـاتووە ) بڵـێ ئـادەم پێغەمبـەرە! ڕەنگە ئەوانەی خوارەوە بەڵگە بن ، کە ئادەم پێغەمبەرە :

١. خـودا فـەرمانی بـە ئـادەم کـرد بـەوەی نـاوی شـتەکان بـە مەلائیکەکان بڵێ

٢. پاش ئەوەی ئادەم و حەوا لە دارە قەدەغەکراوە نزیک بوونەوە و تامیان کرد ، هەر زوو ئادەم پەشیمان بۆوە
٣. لە نێوان خوا و ئادەم گفتوگۆی ڕاستەخۆیان هەبووە ....

ئەمانە هەموو بەڵگەن لە سەر پێغەمبەربوونی ئادەم ...لەوانەیە لە ( بەهەشتی ئادەم لێبوو ) : کە قابیل و هابیل نەبوو و لە گەڵ هەردوو خوشکەکانیان و هیچ نەتەوەیەکی لە سەرەتا نەبوو وەك زۆربەی پێغەمبەرەکانی تر ، بۆیە ناوی وەك پێغەمبەر لە قورئان نەهاتووە!!چونکە پێغەمبەر دەبێ هۆز و خێل و نەتەوەیەك هەبێت تا ئادەم پێغەمبەراتیان بکات . بەڵام کە قابیل و هابیل و خوشکەکانیان دروستبوون . ئادەم هەر تەنیا باوکیان بوو ، بەلکو بووە پێغەمبەریشیان .

لە مەش زیاتر ، زۆربەی ئەوانەی لە سەر ژیاننامەی پێغەمبەرانیان نووسیوە ، ئادەمیان وەك پێغەمبەرێك لە ڕیزی ٢٥ پێغەمبەری ناو قورئان داناوە.

## خەڵقکردنی ئادەم و هەبوونی مرۆڤی تر ؟؟

ئەم ناونیشانە بەرەو ئەوەمان دەبات کەوا وا زەن ببەیین ، کە مرۆڤی تر بە ر لە ئادەم لە بونەوەر هەبوون . نووسەری ئیسلامیش ئەو ڕایەیان هەیە ، بۆ نموونە نووسەری " مع الانبیاء" لەو باوەڕە دایە کە باوەڕهێنان بە مرۆڤی وەك

سـوّلوّ...نیادرتال باوەڕهێنانـــه بـــه " زانســـت "؟؟!! جــاریّ ئـەوەی لــە قورئــان هــاتووە و لــە گــەلّ فــەرمووده دروســتەکانی پێغەمبــەر . کــه هــەمووی جـۆرێکی تــرە لــە وەحــی -ســروش- ، چــونکه لــە قورئانــدا ئـەوها هــاتووە و هــەروەها لــە ســورەتی " رعــد " هــاتووە . کــه هــیچ پێغەمبــەرێك نــاتوانیّ لــە خۆیــەوە ئایــەتێك بــێنیّ!! کەواتــه ئـەوەی لــە قورئــان و فــەرموودەی دروســت هــاتووە دروســته . مێشــکی ئێمــەی مــرۆڤ لــە زانیــاری وەرگــرتن نەگەیشــتۆته ئـەو ئاســته کــه لــەو شــته بگــات کــه لــە قورئان یان فەرمووده هاتووە .

سـەبارەت بـە زانسـت ئـەو حوکمـە ڕەهایـە نـاتوانین بـدەین ، کـە دەربــارەی قورئــان و فــەرمووده دامــان ، چــونکه زانســت زادەی زانیــاری مرۆڤــه زۆری دەکــریّ ڕاســت بــیّ دەشــکریّ پــاش دۆزینــەوەی تــر زاناکــه لــە ڕایەکــەی ســەر چــیخ چــوو بــیّ ، بــەلاّم ئــەوەی لــە قورئــان و فــەرمووده هــاتووە دروســته چــونکه خــوا وتویــەتی هــەروەها هــەر خــۆی بونــەوەر و ئــەوەی لــە بونــەوەره ئــەو دروســتی کــردوون . کەچــی مــرۆڤ دروســتکراوه نــەك دروســتکار! لــە لایــەکی تــرەوه زۆر کــەس زانســت و تیــۆری زانســتی بــە دەســتی ئەنقەســت تێکــەڵ یــەك دەکــەن . کەچــی ئــەوەی دووەم-تیــۆر- تــەنیا گریمانەیەکــە بــە بــیّ ســەلماندن لــە ئــەرزی واقیــع . لەوانەیــە بــەس لــە لایــەن کەســەکه دروســت بێــت یــان هیــوا دەخوازێــت دروســت بــیّ چــونکه لــە گــەڵ ئــەوەی لــە

قورئـان و فـەرمووده هـاتووه ، ناسـازێت و یەکناگرێتـەوه ، بـەو تیـۆرەش دەیـەوێ ئـەوەی لـە قورئـان و فـەرمووده هـاتووه بـە " درۆ بخاتـەوه "!! بـە بـێ هـەبوونی تیـۆریش زۆر لـە میللـەتانی کـۆن لـە پێنـاو مانـەوەی خوداوەندەکـەی خۆیـان ئـەو ڕاسـتیەی پێغەمبـەرەکان ، بـە پێغەمبـەری ئیسـلامیش ، هێناویانـە بـە درۆ بخەنەوه!

زانسـت کـە لـە ٩٠ ٪ دروسـت بـێ و تیـۆر کـە لـە ٥٠ ٪ درۆ بـێ لـەوەدا هـەردووك کـۆکن ، ئەگـەر تـەواو لـە یـەك جیـاوازیش بـن ، زادەی عـەقڵ و تێگەیشـتنی مـرۆڤن !! لێـرەدا نـابێ ئـەو دووه وامـان لێبکـەن کـە گومـان و نیگـەران بـبین دەربـارەی دەقێکـی قورئـان ، چـونکە قورئـان هـەم دروسـتە هـەمیش لـە تـەرەف خوداوەیە و بە هیچ جۆرێ قابیلی هەڵە نییە ..

ئێمـە چـۆن ئـەوه بـاوەڕ بکـەیین ، کـە بـە نـاوی زانسـتەوه دەوترێـت ؟؟ پێشـان ، سـی سـاڵێك بـەر لـە ئێسـتا ، بـاس لـەوه دەکـرا ، کـە مـرۆڤ بـە گەشـە و پەرەسـەندن گەیشـتۆتە ئەو بـارەی ئێسـتای!! یـان دەوتـرا مـرۆڤ لـە جۆرێـك لـە مەیموونـەوه گەشـەی کـردووه و لـە مـاوەی چـەند ملیـۆن سـاڵێکەوه بۆتـە ئـەو مرۆڤـەی هەنووکە!!ئەوانـەی باوەڕیـان بـەوه نییـە کـە لـە ئـادەم و حـەوا پەیدابوونـە ، تیـۆری ئـاوا بـاس دەکـەن کـە شـەرمە ئێمـەی مـرۆڤ ئەگـەر بـۆ نموونـە هێنانـەوه نـەبێ هـەر ئامـاژەشـی پـێ بکـەین

وەك مـــرۆڤ ســـەرەتا لـــە ( تـــۆو-ســـپێرم ) پەیـــدا بـــووە تـــا کۆمەڵگایـــەکی مرۆڤیـــی دروســـتکردووە !! یـــان مـــرۆڤ خـــۆی لـــە مشـــك پەیـــدا بووە!!ئێستاشـــی لـــە گـــەڵ دابـــیٚ لـــە ولاتێکـــی فـــرە مـــرۆڤ وەك هیندســـتان چـــەندەها خوداوەنـــد هـــەن کـــە لـــە شـــێوەی بـــت دان!!لەمـــەش جگـــە لـــەوەی چـــەندەها ئەکتـــەری ناســـراو باوەڕیـــان بـــەو خوداوەنـــدە بتانـــە هەیـــە و لـــە فیلمـــەکانیان دەرهێنەر پڕۆپاگندە بۆ چەند خوداوەندێك ئەکات !

تیـــۆری پەرەســـەندنی مـــرۆڤ لـــە " مەیمونـــەوە بـــۆ مـــرۆڤ " ماوەیـــەك مێشـــکی مرۆڤـــی نیگـــەرانی جـــەنجاڵ کردبـــوو . چـــونکە ئـــەو جـــۆرە تیـــۆرە زۆر دژی پـــەیامی قورئـــان بـــوو ، ســـیکیۆلەری کـــورد لـــە گـــەڵ زۆربـــەی گریمانـــەکانی ئـــەو تیـــۆرە دابـــوون هـــەتا لای هەنـــدێك ببوونـــە بەشـــێك لـــە زانســـتی ســـەلماو ! ئـــەو تێڕوانینـــە لـــە گـــەڵ پێشـــکەوتنی تـــەکنۆلۆژیای ســـەردەم پاشەکشـــێی کـــرد . چـــۆن ئـــەو جـــۆرە تیـــۆرە ، کـــە لـــە تیۆرەکـــەی چـــارلس داروێـــن سەرچـــاوەی گرتـــووە . پاشەکشـــیٚ لـــە بەرانبـــەر تـــەکنۆلۆژیای ســـەردەم نـــەکات کـــە جـــەخت لـــەوە دەکـــات مـــرۆڤ لـــە مەیموونـــەوە پەیدابووە!!؟؟

بـــا بـــزانیین مـــرۆڤ لـــە مەیموونـــەوە گەشـــەی کـــردووە یـــان بـــە پێچـــەوانەوە مـــرۆڤ ، بـــە تایبـــەتی مرۆڤـــی گـــومرا بۆتـــە مـــەیموون؟؟ ئەگـــەر باوەڕمـــان بە هـــەبوونی ئـــادەم نـــەبیٚ -خـــوا نـــەکات -- دەبـــیٚ

وەك مرۆڤـی ژێـر بپرسـین : ئـەدی بـۆ ئـەو گەشـەکردنە ڕاوەسـتا؟ یـان ئــەو گەشــەکردنە هــەموو جــۆرە مەیموونــەکانی تــری نەگرتــەوە؟ مــاوەی ئــەو گەشــەکردنە چــەند ســاڵی خایانــد؟! کەسـانی بـاوەڕدار بـەو تیـۆرە هـەر هێنـدە وەڵامیـان پێیـە ، کـە بڵـێن ئـەو کەسـانەی ئـەو جـۆرە پرسـیارانە دەکـەن کەسـانی دواکـەوتوون !! یـان دەڵـێن ئـەو گەشـەکردنە ملیـۆن یـا چـەند ملیـۆن سـاڵی خایانـدووە!!! بـە هـیچ جـۆرێ ئـەو جـۆرە زانایانـە کەللــە ســەری مرۆڤــی ئاســاییان نەدۆزیتــەوە ، ئــەوەی دۆزیوتیانـەوە کەللـە سـەری ئـەو مرۆڤـە گومڕانەیـە کـە وەبـەر خەشـم و تـوڕەیی خـودا کـەوتوون!! بـەڵێ ، ئەگـەر بـاوەڕ بـەوە بکـەین . کـە ئـەوان کەللـە سـەری مرۆڤـی کۆنیـان دۆزیتـەوە ، یەکسـەر زەنمـان بـۆ ئـەوە دەچـێ کـە ئـەوەی ئـەوان دۆزیونەتـەوە کەللـە سـەری ئـەو کەسـانە بـووە خـوا لـە مرۆڤـەوە کردوونەیتـە مــەیمموون! بــەڵێ ئەوەنــدە مــوعجیزە وەك گــەلانی پێشــوو بــۆ گــەلی موحەمــەد پێغەمبــەر ناهێنێــت ، ئەگــەرنا مەســەلەی بــاوەڕکردن بــەوەی کــە مــرۆڤ بۆتــە مــەیموون زۆر ئاســایی بوو...بـەڵێ ڕەنگـە ئـەوەی ئـەوان دۆزیویەتانـەوە کەللـە سـەری ئـەو مرۆڤانـە بـووە لـە بـەر گوناهیـان زاتـی خـودا کردوویەنەتـە مەیموون...ئەمەش لە دەسەڵاتی خودا دەوەشێتەوە!

باوەڕناکەم مرۆڤی ئەم سەردەمە پڕ تەکنۆلۆژیە باوەڕی بەوە بێ کە باپیری گەورەی مەیموون بووە یان قەبووڵی ئەوە بکات کە باپیرە گەورەی مە یموون بووە!

نووسەری " مع الانبیاء " ، هەرچەندە یەکێ لەو کەسانەیە کە باوەڕی تەواوی بەوەیە کە ئەو بەهەشتەی ئادەم لێبووە بەهەشتی نەمری نییە ، هەندێ بیانوو دەهێنێتەوە بەوەی کە زانست و قورئان دژ بە یەك نیین . باوەڕی بەوەیە کە پێش خەلقی ئادەم مرۆڤی تر لە سەر زەوی هە بووە !! هەروەها باوەڕی بە هەبوونی مرۆڤی " چاوە .......کە یەکەم مرۆڤە لە سەر زەوی ، کۆتا مرۆڤ "نیادرتاڵ " لە سەر زەوی پێش ئادەم هەبووە...لە هەمووی ترسناکتر هەبوونی ئەوانەی بە بڕوابوون بە زانست لێکداوەتەوە!

قورئانی پیرۆز نە کتێبێکی مێژوویە هەموو ڕووداوە مێژوویەکانی قۆناغێك لە قۆناغەکانی بە درێژی لە خۆ گرتبێ ئەمە وانییە کە خوا نە خواستە هیچ ڕووداوێکی مێژوویی لە خۆ نە گرتبێ . چەندەها ڕووداوی مێژوویی لە باسی پێغەمبەرەکان و پیاوچاکان هەتا پیاوخراپانی لە خۆ گرتووە بە پێچەوانەی کتێبەکانی مێژوو و ئەدەب کە هەر تەنیا تایبەت بوونە بە خانەدانەکان و پادشایەکان!!نە کتێبێکی تایبەت بە زانستەوەیە . قورئان زۆر باسی شتی پەنهان لە

زەوی و ئاسمانەکان دەکات ، کە زانست هێشتا پەی پێنەبردووە!! بۆیە لە قورئان زۆر شت هەیە لە پێش عەقڵ و گەڕان و ئەنترۆپۆلۆژیا و زانستی مرۆڤە.

جگە لەوەی نووسەری ئەم پەرتوکە هیچ باوەڕی بەوە نییە ، کە مرۆڤی ( چاوە ) و ( سلۆ...نیادرتاڵ ) بەر لە هەبوونی ئادەم هەبوو بێ! ئەم ڕایەشی لە خۆوە نییە ، بەلکو لە سەر چەند بنەما و شەنگستێك دامەزراوە ، لەوانە :

١. خوای گەورە دەفەرموێ :" لقد کرمنا بنی ادم " "ئێمە ڕێزمان لە بەنی ئادەم ناوە"
٢. خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێ : " و لقد خلقنا الانسان فی احسن التقویم " واتاکەی " ئێمە مرۆڤمان لە چاکترین شێوە دروستکردووە "لە دەقێکی تر دەفەرموێ :" صورکم فأحسن صورکم ...."
٣. خوا دەفەموێ هەندێ مرۆڤی تاوانبارمان کردووە بە مەیموون.
٤. (تەمەن) و( شێوە) دوو شتی لە یەك جودان .

دوور لە ئایدیۆلۆژیا و باوەڕداری و بێباوەڕی مرۆڤ ، خوای گەورە دەفەرموێ :" ڕێزمان لە بەنی ئادەم–مرۆڤ ناوە " ئەو ( ڕێزە ) هەر وەك لە دەقەکەی سەرەوە هاتووە و دوور و نزیك هیچ ئامارەیەك بە ڕەهەندی ( ئیمانی مرۆڤ ) نەکراوە ، بە

واتـــای دەقەکـــە بـــاوەردار و بێبـــاوەڕ دەگرێتـــەوە ..ئـــەو میهرەبانیـەی خـوا تـەنیا لـە بازنـەی یـەکێك لـە ناوەکـانیتی کـە ئـەویش " خـالق-دروسـتکار "-ە . خـودا نەیفـەرمووە " ئێمـە ڕێزمـان لـە موسـلمان یـان بـاوەڕدار نـاوە . بـەلکو فەرمویـەتی ئێمـە ڕێزمـان لـە بـەنی ئـادەم نـاوە " مەسـەلەی خـەلق لـە گـەڵ ئیمـانی مـرۆڤ بـە بەرنامـەی خـودا لـە یـەك جیـاوازن ! خـودای گـەورە ئـادەم و شـەیتانی دروسـتکردووە!! ئیمـانی شـەیتان بـە ڕۆژی دوایـــی و دەســـەڵاتی خـــودا و خـــەلقکردنی زەوی و ئاسمانەکان...لـە سـیکیۆلەرەکان بـە هێزتـرە! بـەڵام ئەگـەر ئـەو مرۆڤــە بــە خۆهیشـتی خـۆی ببێتــە ( بـاوەڕدارێکی ) ئیمــان و کـردار یـەك ئـەوە خـوای گـەورە دەربـارەی دەفـەرمویٚ :( قـد افلـح الممـون....) بـە واتــای " ئــەو مرۆڤــە باوەڕدارانــە ڕزگاریــان بووەکە............".

شـێوەی یـان شـەکلی مـرۆڤ خـاڵێکی تـرە ،کـە خـودای گـەورە زۆر جـەختی لـە سـەر دەکـات .ڕوخسـاری مـرۆڤ وەك مرۆڤـی ئـەمڕۆ بووە.بـە واتـای قورئـان جـەخت لـە سـەر ئـەوە دەکـات کـە هـیچ جیاوازیـەك لـە ڕوخسـار-شـەکلی مرۆڤـی کـۆن و نوێـدا نییـە! هـەر کـە کۆمـەڵگای مـرۆڤ دروسـت بـووە خـودا پـەیامێکی بـۆ ئـەو مرۆڤانـە نـاردووە! بەڵگـەش بـۆ ئـەوە زۆرە ، بـۆ نموونـە : ئەگـەر مرۆڤـە کۆنـەکان ، لـە پـێش هـەموویان ( هـابیلی کـوڕی ئـادەم ) ئەگـەر لـە باوکیـەوە پـەیامی خـودای پـیٚ نەگەیشـت بـیٚ ، چـۆن

خودا سەدەقە و قوربانی و نزای ئەوی قەبوڵ دەکرد؟؟ ئەو پێغەمبەرانەی بەر لە پێغەمبەری ئیسلام هاتوونە لە ڕووی نەتەوە و زمانەوە تایبەت بوونە! کەواتە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ڕووی ژمارەوە کەم یان زۆر : کورد و چینی . بێ هەواڵنێر ( پێشبینیکار –نبی ) و پەیامبەر و خاوەن کتێبی ئاسمان ( رسول ) نە بووە .

بەڵگەی دووەم زاتی خودا دەفەموێ : " مرۆڤم لە سەر چاکترین شێوە دروست کردووە " هەروەها دەفەرموێ :" وێنەم نەخشاندوون و بە باشترین شێوە وێنەم کێشاون " هەندێ تیۆریش جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە ، کە مرۆڤی دێرین قۆناغ قۆناغ پەرەی سەندووە لە قۆناغی یەکەم مرۆڤی ( چاوە یان جاوە ) بووە تا بۆتە مرۆڤی ( نیادرتاڵ ) ئینجا ( مرۆڤی ئێستا ). لە لای نووسەری ئەم نووسینە قسەی خودا دروست و ڕەهایە هیچ گومانێك هەڵناگرێ هەرچی قسەی تیۆرەکانە لە سەر گومان و زەن و گریمان دروستکراوە ناچێتە چوارچێوەی بازنەی ڕەهابوونەوە تا بە ڕاستی حاشا هەڵنەگر حسابی بۆ بکەین!! لە لایەکی ترەوە بەرانبەرەکەی کەلامی خودایە بە واتای کاتێ بەراورد دەکرێ بەوەی لە قورنان هاتووە بە چۆکا دێت و خۆی پێ ڕاناگیرێ . ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ ئێمە باوەڕمان بە دەسەڵاتی زانست و دۆزینەوەکانی زانست نییە ، بەڵام ئەو قسانە زانستی نیین و

مێشك و عەقڵی مرۆڤی دروست قەبوڵی ئەو زەن و گریمانانە ناكات كە ملیۆن و چەند ملیۆنێك ساڵ بەر لە ئێستا ڕوویان دابێ ! گوتمان ئەو قسانە قسەی یەكلاكەرەوەی زانستی سەلماو نیین بەلكو زەن و گریمانی چەند تیۆرێكن هەر بۆ بەرژەوەندی زانست قسەیەك بۆ ڕاستی دینەكەشیان ناكەن !! كە ئەوان باس لە ملیۆن ساڵ و ملیار ساڵ ، هەر خۆیان نەقلیان بۆ ئەوە بچێ چۆن باوەڕ بە شتێكی هێندە كۆن دەكەن و هیچ دەقێكی كۆنكریتی پاڵپشتیان نەكات ؟! لە لای هەندێ لە ئەوان ئاسایە قسەی ئەوان جیاواز بێ لە ئەوەی دەربارەی خەلق لە تەورات –پەیمانی كۆن هاتووە ، ئەو زانایانە چاك دەزانن كە تەوراتی ئێستا زیاتر تەوراتی جولەكەیە ئەو تەوراتە نییە كە بۆ موسا پێغەمبەر دابەزیوە!! بۆیە ئاسایە لە گەڵ ئەوان دژ بێ!! هەندێ لەو توێژەرانە بە جۆرێكی تر شەڕی قورئان دەكەن ، ئەوان سور و ڕژدن لە سەر ئەوەی ئاساییە ئەوەی ئەوان دەیڵێن پێچەوانەی ئەوەی تەورات بێ ! لە زەنی ئەوان ئاساییە ئایین و زانست لە یەك جیاواز بن.لە لای ئەوان ئایین بریتییە لە ئەوەی لە " كتێبی پیرۆز – تەورات و ئینجیل " هاتووە ! دەیانەوێ ئەو قسانە بە ناوی زانستبوونەوە بە گەلانی موسلمانەوە بفرۆشن! كەمیان خەریكی كاری زانستی و توێژینەوەن وەك مۆریس بۆكای و گارودی....لە گەڵ چەندانی تر . هەربۆ نموونە زانایەكی وەك مۆریس بۆكای بۆ ئەوەی زیاتر بگاتە یەقین

بەراوردێکی لە نێوان " تەورات و ئینجیل و قورئان و زانستی نوێ " کرد . بە ئاشکرا وتی ئەوەی لە تەورات و ئینجیل هاتووە لە گەڵ زانستی نوێ کۆک نییە ، بەڵام ئەوەی لە قورئان هاتووە لە گەڵ زانستی نوێ کۆکە و دەسازێت – نووسەری ئەم نامیلکەیە ساڵی ١٩٩٣ بە شێکی ئەو کتێبەی کە لە شێوەی موحازەرەیەك دابوو . لە ئینگلیزیەوە کردە کوردی .

وەك گوتمان زاتی خودا دەفەرموێ :" مرۆڤمان لە چاکترین شێوە دروستکردووە " تەنیا ئەم ئایەتە ؛ کە لە چەند وشەیەك پێکهاتووە چەند ڕاستی پڕ پەنهانی هەڵگرتووە :

١ . خودای گەورە دەفەرموێ :" لقد خلقنا ...." باسەکە باسی ڕابردووە ، چونکە کرداری خلق ڕابردووە و باسەکە باسی ئادەم بووە وەك یەکەم مرۆڤ .

٢ . خودای گەورە بە هیچ شێوەیەك خەلقکردنی یەکەم مرۆڤی نەبەستۆتەوە بە باوەڕی مرۆڤ ، بۆیە خودای گەورە دەفەرموێ : " لقد خلقنا الانسان....." وشەی " الانسان " دوورە لە هەموو ئایدیۆلۆژیەکی سیاسی و عەقیدەیی ، بەڵکو هەموو جۆرە باوەڕێکی سیاسی لە وشەی الانسان ڕاماڵدراوە.

٣. خــودای گــەورە لــە ئایەتەکــە دەفــەرموێ : .....**في احســن تقــويم** مەســەلەی دروســتکردنی مــرۆڤ لــە چــاکترین شــێوە تــەواو جیــاوازە لــە گــەڵ مرۆڤــی چــاوە و ســلۆ و نیادرتــاڵ! مــرۆڤ دوور لــە هــەموو ئایدیۆلۆژیــەك ئــەو کاتــە ڕێــزی لــێ دەگــیرێ کــە شــێوەی بــە چــاکترین شــێوە بــێ . ئــەم ڕایــە پێچــەوانەی ئــەم فــەرموودە نییــە ، کــە لــە ڕووی ئیمانــەوە جــەخت لــە ســەر دڵــی مــرۆڤ دەکــات . پێغەمبــەر دەفــەرموێ :" خــوای گــەورە تەماشــای جەســتە و وێنــەتان ناکــات ، بــەلکو تەماشــای دڵتــان دەکــات " . وەك گوتمــان ئــەم فەرموودەیــە لــە مەســەلەی بــاوەڕی مــرۆڤ دەدوێــت ، نــەك لــە ســەر شــێوەی مــرۆڤ . بــە ناڕاســتەوخۆ پێمــان دەڵــێ ئەگــەر ژینگــەی جیــاواز مرۆڤــی جیــاوازی لــە ڕووی شــەکڵەوە لێفەراهــەم بــوو ، بــە واتــای موســلمانی ئــەوروپی نــابێ نــاز لــە ســەر موســلمانی ئــەفریقی بکــات ، چــونکە لــە ڕووی ئیمانــەوە لەوانەیــە ئەفریقیەکــە باشــتر بــێ هــەروەها لــە تــەرەف پێغەمبــــەرەوەش بــــە هــــاوڕێ نزیکــــەکانی فــــەرمووە : جیــاوازیکردن لــە شــەکڵ تــەنیا بــە قســەش بــێ بــە نــزیکترین هــاوڕێ خــۆی بــە جۆرێــك لــە جاهیلیــەت زانیــووە، بۆیــە خــودا تەماشــای دڵــی مــرۆڤ دەکــات ، نــەك جەســتە و وێنــە! کــە کامــە وێنەی جوان و ڕێکە!!

جیــاوازی ژینگــە مرۆڤــی جیــاواز بەرهــەم دەهێنێــت ! ئەمــە ڕاســتیەکە نکــوولی لــێ ناکرێــت ، بــەڵام ئــەوە بــە هــیچ جۆرێــك

وامـان لێناکـات کـە بـاوەڕ بـە بـوونی مرۆڤـی چـاوە و نیادرتـاڵ بکـەین ، چـونکە ئـەو جـۆرە مرۆڤانـە لـە ئـەنجامی جیـاوازی ژینگـە دروسـتنەبوونە ، بـەلکو وەك خۆیـان بانگەشـە دەکـەن لـە ئـەنجامی فاکتـەری هـەبوونی سـاڵەوە –چـەند ملیـۆن سـاڵێك بـەر لـە ئێسـتا– دەکـەن ! ئەمـەش لـە ڕووی زانسـتەوە قسـەی لـە سـەر نـاکرێ ، بـەلکو دەبـێ پشـت بـە زەن و گریمـان ببەسـتێ . لـە هـەمووش گـرینگتر خـودا دەفـەرمووێ مرۆڤمـان لـە چـاکترین شـێوە دروسـتکردووە ، کەچـی مرۆڤـی کـە وا زەن دەبـردرێ یەکەم مرۆڤ بێ بە ناشیرترین شێوە بووە!!!!

چـاکترین شـێوە واتـای ئـەوە ناگەیـەنێت کـە یەکـەم مـرۆڤ کـە نادەمـە ، نـەك چـاوە ، مرۆڤێکـی پێسـت سـپی ، چـاو شـین ، پـرچ زەرد.....بوو بێ!!!

بەڵگـەی سـێیەم هـەبوونی تیـۆری بـە مـەیمونبوونی مرۆڤـە ، بـە واتـای ئـەو تیـۆرەی کـە دەڵێـت : لـە بەراییـدا ئـەو مرۆڤـەی ئێسـتا لـە مـەیمون گەشـەیان کـردووە! **ئـەم تیـۆرە لـە سـەر چـەند بنەمایەك هەڵدەوەشێنینەوە :**

١.ئەگـەر وا زەن ببـەیین کـە مرۆڤـی ئێسـتا لـە مـەیمون وەپاشـکەتوون ، ئـەدی بۆچـی مرۆڤەکـە لـەو سـنورەی گەشـەکردن یـا پەرەسـەندن ڕاوەسـتاوە!! ئـەدی بۆچـی ئـەو مەیموونانـەی تـر مـاون گەشـەیان نـەکردووە؟؟ یـان هـەر بۆچـی

ڕەگــەزی مــەیموون مــاوە؟؟ هەرچــەندە لــە چــەندەها کتێــب وەك :" داروویــن لــە تــەرازووی ژێریدیــدا"-هــی محەمــەد شــارەزووری ، کتێبەکـــــەی یـــــەحیا هاروون...........وەڵامدراونەتـــــەوە و فەشــۆڵی تیۆرەکــەیان دەرخســتووە.لە لایــەکی تــر زانســتی نــوێ ئەو تیۆرەی داروینی ڕەتکردۆتەوە!

٢.خــودای گــەورە هەنــدێ مرۆڤــی تاوانبــاری کردۆتــە مــەیمون. بــە واتــای بــە پێچــەوانەی تیــۆری ســەرەوە . قورئــان جــەخت لــە ســەر ئــەوە دەکاتــەوە کــە مــرۆڤ بۆتــە مــەیموون ؛ نــەك مــەیمون گۆڕانکــاری بــە ســەردا هاتبێــت بووبتــە مرۆڤــی ئێســتا!هەندێ ڕاڤــەکاری کــورد لــەو مەســەلەیە دواون بــە کــورتی گوتیانــە هەنــدێ جولەکــەی بێبــاوەڕ بــە هــۆی تــاوانکردن دژی ماســی گــرتن لــە ڕۆژی شــەموان ، خــودا خــەشمی لێگرتــوون و ئەوانــەی کــردووە بــە مــەیموون !! ئەمــەش لــە چــەند دەقێکــی قورئــان هاتووە .

٣.لەوانەیـــە هەنـــدێ توێـــژەر ئێســـقانی ئـــەو مرۆڤانـــەی دۆزیبێتــەوە کــە لــە مرۆڤبــوون لــە بــەر تاوانــەکانیان کراونەتــە مەیمون! بۆیە باوەڕیان بە تیۆری پەرەسەندن هەیە!!

بەڵگــەی چــوارەم ئــەوە ڕووندەکاتــەوە کــە تەمــەن و شــێوە لــە یــەك جیــاوازن .قورئــان جــەخت لــە ســەر شــێوەی جیــاوازی مــرۆڤ دەکات . لە چەند ئایەتێکدا باسی جیاوازی تەمەن کراوە:

١. بە گوێرەی دەقێکی قورئان نووح پێغەمبەر نۆسەد و پەنجا ساڵ هەر تەنها بانگەوازی نەتەوەکەی بۆ لای خودا کردووە !! ( فلبث فيهم ألف سنة الا خمسين عام
٢. خوای گەورە دەفەرموێ :" ....خير من الف شهر ...."

هەندێك دەڵێن لە کۆندا سەدەیەك هەزار ساڵ بووە ، نەك سەد ساڵ! هەتا نووسەری مع الانبياء ڕای کەسێکی وەك سێر لیۆنارد بە هەند هەڵدەگرێ کە ساڵی ١٩٢٠ هاتۆتە عێراق کە دەڵێ شوێنەواری کەشتیەکەی نووح لە نزیك شاری ئوور بووە کەچی ساڵی ١٩٨٠ کە شاندێکی ئەمریکی و ڕۆژئاوایی کە دەچێتە شاخی جودی و شوێنەواری کەشتیەکە دەدۆزنەوە!! لە لای من ئاساییە شوێنەوارەکەی کەشتیەکەی نووح لە کوێ بێت . من جاش و پێشمەرگەی نەتەوەکەم لە یەك جیاواز دەکەمەوە ! بەس بۆ ڕاستی خوای گەورە دەفەرموێ :" فاستوى على الجودى ) چیای جودی لە باکوری کوردستانە و شاری نووح –شەرناخ– لە باکوری کوردستانە بە بەڵگە خوایی و مرۆڤکردە!!

ئەو جیاوازی تەمەنە نابێتە جیاوازی لە شێوەدا –شێوەی مرۆڤبوون .وێڕای ئەوەش هیچ جیاوازیەکی جەستەیی لە نێوان نووح پێغەمبەر و محەمەد پێغەمبەر نییە ، کە هەردوو لە ماوەی جیاوازدا ژیاون و لە تەمەنی جیاواز ژیاون .

## ئه نجام

هەرچەندە ئەم توێژینەوەیە کورتە لە ڕووی لاپەڕەوە ، بەڵام باس لە باسێکی گەورە دەکات. بە پێی هەندێ تیۆری بە ناوی زانستی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مرۆڤ مەیمون بووە . دوای لێکۆڵینەوە و تێفکرین لە مەسەلەکە گەیشتوونەیە ئەو ڕاستیەی کە ئەو ڕاستیەی قورئانیان سەرا و گێر کردووە ، کە دەفەرموێ هەندێ تاوانبارمان کردۆتە مەیمون . کە گۆڕی ئەو کەسانەیان هەڵداتەوە یان بە هۆی هەندێ گۆڕانکاری ژینگەیی هەندێ ئێسك و پڕوسکیان دۆزیوەتەوە، گشتگیریان کردووە و گووتیانە مرۆڤ لە مەیمون وەپاش کەوتووە!!

وێڕای ئەوەش نووسینەکە لەگەڵ ڕای هەندێ توێژەری سیکیۆلەر و توێژەری ئیسلامی تێکناکەتەوە! نووسەری ئەم چەند دێرە باوەڕی ئەوهایە ئەو بەهەشتەی کە ئادەمی لێ بووە تەنها باخێك بووە ، نەك بەهەشتی نەمری !لەمەش زیاتر . مرۆڤی سەرەتا و کۆتا یەکشێوەی هەبووە ، ئەو شێوەش ڕێك بووە نەك شێوە وەك مەیمون بووە !

## دەروازە

وابزانم بەهاری ٢٠٠٩ بوو لەگەڵ حاجی ئوسامەی کاکم باسی هەندێک بابەتی فکری ئیسلامیمان دەکرد قسە هاتە سەر زەواجی پێغەمبەر {علیە الصلاة والسلام} و خاتو عائیشە ی دایکی ئیمانداران.. حاجی ئوسامە گوتی مژدەیەکی خۆش ماوەیەک پێش ئێستا لەکەناڵی ئاسمانی الحوار {عزام التمیمی } مێوانداری {جەمال بەننا}ی برای {پێشەوا حەسەن بەننای} دامەزرێنەری کۆمەڵی ئیخوان موسلمین کرد و لەمیانەی بەرنامەکەدا جەمال بەننا گوتی کەوا گەنجێکی میسری بە ناوی {اسلام البحیری}لە توێژینەوەیەکی زانستی و دەگەمەندا دەریخستووە کە ئەوکاتەی عائیشەی دایکی ئیمانداران زەواجی لەگەڵ پێغەمبەر کردووە تەمەنی نۆساڵان نەبووە وەک باوە بەڵکوو تەمەنی ١٨ ساڵان بووە!! بەڕاستی کە ئەو قسەیەم بیست چی نەمابوو لە خۆشیان باڵگرم و پەروانە ئاسا بفڕم !!! بەهەرحاڵ خۆم گەیاندە ئەنتەرنێت ولێکۆڵینەوەکەی اسلام البحیری م دۆزیەوە .. کە دۆزیمەوە یەکسەر بە حاجی ئوسامەم پیشاندا ئینجا بە

بـابم و چەنـد دۆسـت و بـرادەریکیش دیـاربوو هـەموویان زۆریـان بـە دڵ بـوو دڵخۆشـیش بـوون بـەلاچونی ئـەو تەموومژەی کە سەردەمانێکی زۆرە باڵی کێشاوە بەسەر ئەم بابەتەدا ..ئیدی هەستام بە وەرگێرانی توێژینەوەکەو ئامـادەم کـرد بـۆ بڵاوکردنـەوەی بـەڵام راسـتیتان دەوێ ترسێکی زۆرم هەبوو لە بڵاوکردنەوەی چونکە ئەم بابەتـە بابـەتێکی زۆر هەسـتیارەو رەنگـە دڵـی هەنـدێک لـە موسلمانان برەنجێنێ و بڵێن چۆن دەبێ رەخنە لە هەردوو پێشـەوایان بوخـاری وموسـلیم بگیـرێ وسـەحیحەکانیان بخرێتـە ژێـر پرسـیارەوە ؟!! بێئاگـا لـەوەی کـە بوخـاری وموسـلیم رەحمـەتی خودایـان لێبێـت هـەردووکیان وەک تـەواوی ئینسـانەکان ئینسـان بوونـە و ئینسـانیش مەعسـووم نیـەو قـابیلی هەڵـەکردن وبیرچوونـەوەو هەموشتێکە ..ئەوە بـوو پاش پـرس ورایـەکی زۆر بڵاوم کردەوەو سوپاس لـەبۆ خـودای گـەورە سـەدایەکی چـاکی هـەبوو .. پـاش ماوەیـەک هـەر لەرێگـەی ئەنتەرنێتـەوە ئاشنابووم بەنوسینەکانی نوسـەری سوری {نـادر قـریط} ئەو نادرە ئەگەرچی بەناسنامە مەسیحیە بەڵام لادینیـەو بـڕوای بـە هـیچ دینێـک نیـە !! ئـەوەی سـەیرە نـادرقریط قەڵـەمێکی زۆر بەئینسـانی هەیـەو چەنـدین جـار زۆر

بەسەیری بەرگری لەئیسلام وپێغەمبەرکردووە!! بە هەرحاڵ یەک لەوبابەتانەی ئەو نوسەرە کە سەرنجی راکێشام بابەتێک بوو بە ناوونیشانی { لصوص ومغفلون بین جمال البنا و اسلام البحیری }و تیایدا بەبەڵگەی تەواوەوە دەریخستبوو کە البحیری ئەم لێکۆڵینەوەیەی نەنوسیووە بەڵکوو تەنها وەرگێڕێکەو بەس !! نادر دەڵێ : نەمن ساڵی ٢٠٠٠ ئەوبابەتەم لە گۆڤارێکی ئەڵمانی دیووە و هەتا خێزانەکەشم زۆر دڵی بەو لێکۆڵینەوەیە خۆشبوو .. بەڵێ نادر قریط دەریخست کە ئەو کەسەی ئەو لێکۆڵینەوە دەگمەنەی نوسیووە فیزیا ناسێکی ئەمریکی موسوڵمانەو ناوی { تی ئۆ شەنەڤازە} ساڵی ١٩٩٩ لەو پێگەیە بڵاوی کردۆتەوە
www.ilaam.net/articles/ayesha.html

!!! کەچی اسلام البحیری ساڵی ٢٠٠٨ دێت و پڕبەگەرووی هاوار دەکا و بێشەرمانە دەڵێ هەڵەی سەدەها ساڵی زانا گەورەکانی پێشەخۆم راستکردۆتەوە !!!! ئینجا دوای ئەمە ئیمێلێکم بۆ مامۆستای خۆشەویست {مامۆستا سەلام ناوخۆش }نارد کە ئەوکات لە لەندەنی پایتەختی بریتانیا بوو پێم گوت : مامۆستا بابەتێکی وەها هەیەو ئەگەر مەجالت هەیە دەتوانی تەرجەمەی کەی ؟ مامۆستا وەرامی

دامەوەو گوتی بەڵێ مەجالم هەیە و بینێرە ، ئیدی بابەتەکەم بۆ مامۆستا ناردو ئەویش هەر لەوێندەر تەرجەمەی کرد و لەبۆمی هەناردەوەو ئەرکی بڵاوکردنەوەی بەمن سپارد.. بێگومان ئێمە لەو کارەمان تاکە مەبەست بەرگریکردنە لە ئیسلام وپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خاتوعائیشەی دایکی ئیمانداران ..چونکە مەسەلەی زەواجی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) لەگەڵ خاتو عائیشە یەکێکە لەو مەسەلانەی کە دژەدین وموفلیس وفاشیلان هەمیشە وهەمیشە کردوویانە بەهۆکارێک بۆ خۆشکردنی بازاڕە کەسادەکەیان .. دووبارە سوپاسی حاجی ئوسامە دەکەم کە لە ڕێگەی ئەوەوە گەیشتینە ئەو توێژینەوەیەو بەهەمان شێوە زۆر سوپاس بۆ مامۆستا سەلام ناوخۆش کە بەو زمانە جوانە توێژینەوەکەی تەرجەمە کرد .. بەهیوای تەندروستیەکی باش بۆ مامۆستا سەلام.

موسعەب جەمیل
هەولێر. کوردستان
١٧.٦.٢٠١٢

## تەوەری دووەم
## ئایا عائیشە بوكێكی شەش ساڵانە بوو؟

نووسینی: T. O. Shanauas

**وەرگێڕان و كورتكردنەوەی لە ئینگلیزییەوە: سەلام ناوخۆش**

جارێـك برادەرێكـی فەلە(مەسـیحی)م لێمـی پرسـی: "كچـە حـەوت ساڵیەكەی خۆت دەدەیتە پیرەمێردێكی پەنجا ساڵی؟"

ئەوسا من بێدەنگ بووم. ئەویش هـەر بـەردەوام بـوو: "ئەگـەر بەمـە رازی نابی، ئەی چۆن بەوە رازی دەبی عائیشەیەكی حەوت ساڵانەی بەری بدرێتە پێغەمبەرەكەت؟!".

منیش وتم: "هەنكە هیچ وەڵامێكم بۆ پرسیارەكەت پێ نییە!"

برادەرەكەم كە ئەمـەی گـوێ لێبـوو زەردەخەنەیـەكی بـۆ كـردم، بـەڵام دڕكێكی لە دڵی باوەڕەكەمی جێهێشت!

زۆربەی موسڵمانان ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی ئەوسایان تـەواو پـێ قـەبوڵ بـوو، ئەگـەرنا خـەڵك بـەو هاوسـەرگیریەی پێغەمبـەر( درودی خـوای لـە سـەر) و عائیشـە رازی نـەدەبوون! ئـەوە وەڵامـی ئـەو

کەسانەیە کە ساویلکەن و سادەن و هیچ ناخوێننەوە، هەروەها هیچ لێکدانەوەیەکیان بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە نییە، هەرچی خۆم بووم ئەوە هەرگیز بەو وەڵامە قەناعەتم لا دروست نەبوو.

بێگومان پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) مرۆڤێکی تەواو جیاواز بوو، نمونە بوو هەموو کردەوەکانی پاك و تەواون. ئێمەی موسڵمان پەیڕەویان دەکەین، لاساییان دەکەینەوە. وێڕای ئەمە، زۆربەی ئەو خەڵکانەی لە مەڵبەندی ئیسلامی تۆلیدۆ -Toledo-ن لەنێویان من. هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە کچێکی حەوت ساڵانەیان بدەنە پیاوێکی ٥٢ ساڵی. ئەگەر باوکێك بەوجۆرە بەشودانە رازی بێ ئەوە زۆربەی خەڵك، ئەگەر نەڵێم هەمووی، بەچاوێکی کەم سەیری ئەو باوکەو مێردە پیرەکە دەکەن.

هەرچەندە من هیچ بەڵگەیەکی کۆنکریتم نەبوو جگە لە رێزم بۆ پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) ، بەڵام ئەگەر ئەوەش باوەڕم وابوو، ئەوە زەنم وابوو کە ئەو چیرۆکانەی لەبارەی ئەو هاوسەرگیرییەی پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) و عائیشە هەن جگە لە ئەفسانە هیچی تر نین.

گەڕانم بەدوای ئەو پرس و پرسیارەدا گومانەکەمی کردە یەقین. پێغەمبەری من جێنتڵمانە، هەرگیز کچێك ناهێنێت تەمەنی حەوت ساڵ بێ یان نۆ ساڵ. لەو بەدواداچوونەم بۆم دەرکەوت کە تەمەنی عانیشە بە (هەڵە) لە ئەدەبیاتی حەدیس هاتووە! لەمەش زیاتر

ئەوانەی ئەو فەرمودەیان گێڕاوەتەوە جێگای متمانە نەبوون. ئەو هەموو کێشەیە لە گێڕانەوەی( هیشامی کوڕی ئوروە) سەری هەڵداوە!

لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەم ئەو بەڵگانەی خوارەم پێشکەش بکەم، کە هەموویان تەواو ئەو گێڕانەوەی هیشام کوڕی ئوروە هەڵدەوەشێننەوە.

## بەڵگەکانی من

بەڵگەی یەکەم:، زۆربەی ئەو گێڕاوانەی لە کتێبەکانی فەرمودە هاتوون . ژێدەری باوەڕپێکراو یاخود سەرچاوەی متمانەو گومان هەڵنەگرن . لەبارەی ئەو بابەتەوە لە هیشامەوە ریوایەت کراوە، ئەویش لە باوکیەوە وەریگرتووە. پێش هەموو شتێ، لەرووی لۆژیك و بنەماکانی فەرمودەناسیەوە، دەبێ روداوێکی ئەوها (دوو سێ) کەس ریوایەتی کردبێت نەك (تەنیا کەسێك). لە لێبوردبونەوەمان لەم مەسەلەیە بۆمان دەرکەوت کە تەنیا و تەنیا هیشام ئەو ریوایەتەی کردووە. هیچ کەسێك لە( مەدینەی منەوەرە ) هەتا هیشام خۆیشی هەتا لە مەدینە بووە، ئەو فەرمودەیەی نەگێڕاوەتەوە، قوتابیەکانی هیشامیش لەنێویان مالیکی کوڕی ئەنەس فەرمودەی ئەوهای نەگێڕاوەتەوە، بە شێوازێکی زنجیرەی راویەکانی ئەو فەرمودەیە هیچیان خەڵکی مەدینە نین، بەڵکو سەرچاوەی ئەو چیرۆکە لەزاری عێراقیەکانەوەیە. دوای ئەوەی

هیشام مەدینە بەجێدەهێڵێت دەچێتە عێراق، لە عێراقەوە ئەو (چیرۆکە) سەرهەڵدەدات نەک لە مەدینەوە.

کتێبی (تهذیب التهذیب) یەکێکە لە کتێبە متمانە پێکراوەکانی بواری فەرمودەناسی و لە ژیانی راویەکانی فەرموده دەدوێت، ئەو کتێبە دەڵێت بەگوێرەی (یاقبی کوڕی شەیبا) هیشام یەکێکە لەو راویانەی کە گێڕانەوەکانی تەواو جێگای متمانەن و هەموو گێڕانەوەکانی قەبوڵکراون، تەنیا ئەو گێڕاوانەوانە نەبێت ، کە لەپاش ئەوەی چۆتە عێراق ریوایەتی کردوون.

(سەیری–تهذیب التهذیب– ابن حجر العسقلاني– دار التراث الاسلامي، سەدەی ١٥، بەرگی ١١، ل٥٠ بکە)

هەر لە هەمان لاپەڕە هاتووە کە مالیکی کوڕی ئەنەس هەموو ئەو گێڕاوانەی هیشامی رەتکردۆتەوە، کە لە ڕێگای عێراقیەکانەوە ریوایەت کراون.

کتێبێکی تر لە بواری ژینامەی راوییەکانی فەرمودەوە کتێبی "میزان الاعتدال Mizanul-aitidal–"ـە. نوسەری ئەو کتێبە لەبارەی کەسایەتی هیشامەوە دەنووسێت: "کاتێك هیشام پیربوو زاکیرەی زۆر خراپ ببوو".

سەیری لاپەڕە (٣٠١)ی بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە بکە.

لەمەدا، دەگەینە ئەو ئەنجامە: هیشام لە پیری زاکیرەی (یادەوەری) خراپ بووە، هەروەها ئەو کەسانەی لە عێراق فەرمودەیان لە ئەو ریوایەت کردووە جێگای متمانە نەبوونە، بۆیە ئەو ریوایەتەی دەربارەی هاوسەرگیری عائیشە و تەمەنی عائیشە ریوایەتی گردووە جێگای متمانە نییە.

وێڕای ئەمەش، کرۆنۆلۆژیای روداوەکان پەیوەندیدار بە مێژووی ئیسلامەوە گرنگە بۆ زیاتر هەڵوەشاندنەوەی چیرۆکەکەی هیشام بن ئروە:

* پێش ٦١٠- سەردەمی جاهیلی- پێش دابەزینی سروشت- وەحی-.
* ٦١٠ یەکەم دابەزینی سروش.
* ٦١٠ ئەبوبەکر موسڵمان دەبێت.
* ٦١٣ پێغەمبەر بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ ئیسلام دەکات.
* ٦١٥ کۆچ بەرەو حەبەشە.
* ٦١٦ عومەری کوری خەتاب موسڵمان دەبێت.
* ٦٢٠ مارەبڕینی عائیشە بۆ پێغەمبەر ( درودی خوای لە سەر ).
* ٦٢٢ کۆچکردنی پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) بۆ مەدینە.
* ٦٢٤/٦٢٣ رازیبوونی عائیشە ببێتە هاوسەری پێغەمبەر.

## بەڵگەی دووەم: مارەبڕین The Betrothal

بەگوێرەی تەبەری (هەروەها هیشام بن ئورە، ئیبن حنبل و ئیبن سعد) ئایشە لە تەمەنی حەوت ساڵی لە پێغەمبەر مارەکراوەو لە تەمەنی نۆ ساڵی گواستراوەتەوە!!

تەبەری لە کارێکی تری دەنووسێ: "هەر چوار منداڵەکەی ئەبوبەکر لە هەردوو ژنەکەی لەسەردەمی پێش ئیسلامی لەدایک بوونە (لە سەردەمی جاهیلی) بەرگی چوارەم، لاپەڕە ٥٠ی تاریخ الامم و الممالیك، دار الفكر، بیروت ١٩٧٩.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەگەر عائیشە لەساڵی ٦٢٠ (لە تەمەنی حەوت ساڵی) لە پێغەمبەر مارەکرابێت و لە ساڵی ٦٢٤ (لە تەمەنی نۆساڵی) بووبێتە هاوسەری پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ). ئەوە دەبێت بەگوێرەی تەبەری هەر خۆی، عائیشە لەساڵی ٦١٣ لەدایک بووبێت، ئەمەش هەڤدژە لەگەڵ ئەو رایەی تەبەری خۆی کە دەڵێ منداڵەکانی ئەبوبەکر لەسەردەمی جاهیلی لەدایک بوو بن؟! ئەو دوو رایە پێچەوانەی تەبەری، جارێك زەواجی عائیشە بە (٩)ساڵ و جارێکی تر بە لای کەمی بە (١٤) دادەنێ. کەواتە لەو روانگەوە، رای تەبەری لەسەر تەمەنی عائیشە جێگای متمانە نییە، ناکرێ پشتی پێ ببەسترێ!

## بەڵگەی سێیەم: تەمەنی عائیشە بە بەراورد بە تەمەنی فاتیمە

ئیبن حەجەر لە (الاصابە فی تمییز الصحابە- بەرگی چوارەم- لاپەڕە ٣٧٧) دەنووسێ: "فاتیمە لە سەردەمی دوبارە بونیاتنانەوەی کابە-کەعبە لەدایك بووە، ئەوسا پێغەمبەر ٣٥ ساڵ بووە.. فاتیمەش پێنج ساڵ لە عائیشە گەورەتر بووە." بە گوێرەی ئەو رایەی ئیبن حەجەر، کاتێك عائیشە لەدایك بووە، پێغەمبەر تەمەنی ٤٠ ساڵ بووە. کاتێك پێغەمبەر بۆتە ٥٢ ساڵ، عائیشەش تەمەنی ١٢ ساڵ بووە.

## بەڵگەی چوارەم: تەمەنی عائیشە بە بەراورد بە تەمەنی ئەسما

بەگوێرەی قسەی عبدالرحمن کوڕی ابی زناد: "ئەسما دە ساڵ گەورەتر بووە لە عائیشە" بەرگی دووەم، لاپەڕە ٢٨٩.

هەرچی ئیبن کەسیرە لە بەرگی (٨)ی لاپەڕە ٣٧١ ی (البدایە والنهایە) دەنووسێ: "ئەسما بە دە ساڵ لە عائیشەی خوشکی گەورەتر بووە". هەروەها ئیبن کەسیر دەنووسێ: "ئەسما کوشتنی کوڕەکەی خۆی لەساڵی ٧٣-ی کۆچی بینیوەو پێنج رۆژ دوای ئەو روداوە خۆیشی مردووە. بە گوێرەی هەندێك گێڕانەوەی تر (دە، بیست، زیاتر، ١٠٠ رۆژ) دوای ئەو روداوی کوشتنی کوڕەکەی، ئەوسا خۆیشی مردووە، ئەوساش تەمەنی سەد ساڵ بووە.

ئیبن حەجەر وەك ئیبن كەسیر دەنووسێ ئەسما لە تەمەنی (سەد ساڵ)ی كۆچی دوایی كردووە، ئەو ساڵەش ساڵی ٧٣ یان ٧٤ی كۆچی بووە.

**تەماشای لاپەڕە (٦٥٤)ی تقریب التهذیب بكە.**

بەگوێرەی نزیكەی هەموو مێژوونووسان، ئەسما (دەساڵ) لە عائیشە گەورەتر بووە. ئەگەر ئەسما لەساڵی ٧٣ی كۆچی تەمەنی سەد ساڵ بووبێت، ئەوە دەبێت لەكاتی هیجرەت تەمەنی ٢٧ یان ٢٨ ساڵ بووبێت! ئەوەش بەگوێرەی هەموو سەرچاوەكان (دەساڵ) لە عائیشە گەورەتر بووبێت، ئەوە دەبێت عائیشە لەكاتی هیجرەت حەڤدە یان هەژدە ساڵ بووبێت! كەواتە كە عائیشە بۆتە هاوسەری پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) ، تەمەنی (نۆزدە) یان (بیست) ساڵ بووە.

بەگوێرەی بەڵگەی چوارەم كە لەسەر ڕاكانی ئیبن حەجەر، و ئیبن كەسیر و عبدالرحمن مكوڕی ئەبی زەناد بیناكراوە، كاتێك عائیشە شووی بە پێغەمبەر ( درودی خوای لە سەر )كردووە تەمەنی (نۆزدە) یان (بیست) ساڵ بووە.

ئەمەو ئیبن حەجەر لە بەڵگەی سێیەم تەمەنی عائیشە بە دوازدە ساڵ و لە بەڵگەی چوارەم تەمەنی عائیشە بە حەڤدە یان هەژدە ساڵ

دادەنێ. ئەو هەڤدژی و ناکۆکیەی ئیبن حەجەر جێی متمانە نییە، ئایا عائیشە (١٢) یان (١٨) ساڵ بووە؟ کامەیان راستە؟!

## بەڵگەی پێنجەم: شەڕی بەدر و ئوحد

بەگوێرەی ریوایەتی موسلم عائیشە لە شەڕی بەدر بەشداری کردووە، هەروەها بەگوێرەی بوخاری عائیشە لەگەڵ (ئوم سلیم) بەشداری شەڕی ئوحدی کردووە.

لە (کتاب المغازی- باب الغزوات) بوخاریدا هاتووە: "ئیبن عومەر دەڵێ پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) ڕێی پێنەدام لە شەڕی ئوحد بەشداری بکەم، چونکە ئەوسا تەمەنم چواردە ساڵ بوو، بەڵام لە شەڕی خەندەق کە تەمەنم پازدە ساڵ بوو، پێغەمبەر ڕێی پێدام کە لەو شەڕە بەشدار بم، چونکە تەمەنم پازدە ساڵ بوو".

ئەمە لەلای پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) یاسا بوو، ئەو کەسانەی تەمەنیان لەخوارەوەی پازدەساڵی بووە نەیهێشتووە لەشەڕ بەشداری بکەن. کەواتە تەمەنی پازدە ساڵی مەرج بووە بۆ ئەوەی هەرکەسێ بتوانێت بەشداری شەڕ بکات. جا ئەگەر ئەمە بۆ کوڕ بێ، دەبێ بۆ کچ چۆن بێ؟! ئەو بەشدارییەی عائیشە لە (بەدر) و (ئوحد) تەواو ئەوە ساغ دەکاتەوە کە عائیشە تەمەنی لە سەرووی پازدەساڵیەوە بووە، ئەگەرنا پێغەمبەر ڕێی پێنەدەدا بەشداری شەڕ بکات.

## بەڵگەی شەشەم: سورەتی القمر

دابەزینی سورەتی القمر بەڵگەیەکی ترە، چیرۆکی نۆساڵەی تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) هەڵدەوەشێنێتەوە.

بەگوێرەی دابێکی باوەڕپێکراوی گشتی عائیشە هەشت ساڵ بەر لە هیجرەت لەدایك بووە، بەڵام بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی تر کە لە بوخاریدا هاتووە: "عائیشە دەڵێت من کیژۆڵەیەکی گەنج-جاریە- بووم کە سورەی ئەلقەمەر -مانگ -دابەزی. ئەو سورەتەی قورئان هەشت ساڵ پێش هیجرەت دابەزیوە.

جا ئەگەر ئەو بانگەشەیەی دەکرێ کە عائیشە لە ساڵی ٦٢٣ یان ٦٢٤ تەمەنی نۆ ساڵ بووبێت و شووی بە پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) کردبێت. ئەوە دەبێ لە سەردەمی دابەزینی سورەتی ئەلقەمەر عائیشە زارۆك-سەبیلۆکە- صبیە بووبێ نەك (جاریە!). کە ئەمەش پێچەوانەی مێژووی دابەزینی قورئانە!!

بەگوێرەی روداوی دابەزینی سورەتی ئەلقەمەر عائیشە گەنجێکی چالاك بووە، چونکە وشەی (جاریە) لە عەرەبی بە کچێك دەوترێت تەمەنی ٦-١٣ ساڵ بێت. ئەم لێکدانەوە ماتماتیکیە دەکرێت بەم هاوکێشەیە چارەسەر بکەین:
کاتی دابەزینی سورەتەکە هەشت ساڵ پێش کۆچکردنە.

تەمەنی عائیشە ئەوسا ٦-١٣ ساڵ بووە.

تەمەنی عائیشە لەکاتی کۆچکردن ١٤-٢١ ساڵ بووە.

تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر ١٥-٢٢ ساڵ بووە.

٨ : پێش کۆچ.

٦-١٤: لێکدانەوەی واتای جاریە.

١ : کۆچی

تەمەنی عائیشە:

کەمترین تەمەن: ١٥ساڵ.

زۆرترین تەمەن: ٢٢ ساڵ.

تەمەنی تەقریبی: ١٩ ساڵ.

## بەڵگەی حەفتەم: تەرمینۆلۆژی عەرەبی

بەگوێرەی گێڕانەوەیەك كە لە موسنەدی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل داهاتووە، پاش مردنی خەدیجە، یەكەم هاوسەری پێغەمبەر، خەولەخان هاتۆتە لای پێغەمبەر، داوای لێكردووە كە جارێكیتر ژن بهێنێتەوە. لە وەڵامدا پێغەمبەر( درودی خوای لە سەر ) پێی فەرموە: هیچ كەسێكت لە خەیاڵدایە؟ خەولەش پێی فەرمووە: دەتەوێت كچ (بكر) بێنیت یان بێوەژن (ثیب)؟ كاتێك پێغەمبەر پێی دەڵێت : كچ . خەولەش دەڵێت كە كچێكی لە خەیاڵ دایە بۆی؟ خەولە ناوی عائیشەی هێناوە.

ئەوانەی شارەزای زمانی عەرەبین چاك دەزانن وشەی (بکر) لە زمانی عەرەبی بۆ کچێکی نابالغی تەمەن نۆساڵە بەکار نایەت، بەڵکو بۆ کچی نابالغ "بالەق نەبوو- خۆ نەناسیو". عەرەب وشەی (جاریە)ی هەیە. وشەی "بکر" لەزمانی عەرەبیدا بۆ ئەو کچانە بەکاردێت کە شوی نەکردبێت، هەروەها ئەزموونی سێکسی پێش زەواجکردنی نەدیتبێت. لەم روانگەوە بەراشکاوی دەتوانین بڵێین کە خەولەخان چاك دەیزانی عائیشە کاتی شوکردنی هاتووە، بۆیە بۆ پێغەمبەری دیارکردووە، هەروەها لەروی زمانەوەش بەهیچ جۆرێك وشەی "بکر" بۆ کچێکی تەمەن نۆساڵە بکار نایەت.

سەیری موسنەدی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، بەرگی شەشەم، لاپەڕە ۱۲۰. چاپی دار احیاء التراث العربي، بکە.

لەم گێڕانەوەیەش دەردەکەوێت کە عائیشە نەك لەکاتی زەواجکردن، بەڵکو لەکاتی دیارکردن و مارەبڕینیش لە رووی سێکسیەوە تەواو خۆی ناسیوە، بۆیەش خەولەی دۆستی خەدیجە، عائیشەی بۆ پێغەمبەری دیارکردووە.

## بەڵگەی هەشتەم: دەقە قورئانییەکان

هەموو موسڵمانەکان ئەو راستییەیان تەواو قەبوڵە کە قورئان رابەرنامەیە، ئاراستەنامەیە. لەبارەی مەسەلەی تەمەن و زەواجی عائیشەش با لە دەقە قورئانییەکان بگەڕێین بۆ ئەوەی ئەو

"تارمایی" و "دوکەڵ" و "لێڵی" و "سەر لێتێکچونانە" لابەرین کە هەندێك لە پیاوە ناودار و دیارەکانی سەردەمی کلاسیکی ئیسلام لە دیارکردنی تەمەن و زەواجی عائیشە خولْقاندویانە! با بپرسین ئاخۆ قورئـان ڕێ دەدا یـان ڕێ نـادا بـە پرۆسـەی هاوسـەرگیری کچـێکی خۆنەناسیوی تەمەن حەوت ساڵە؟

لەقورئاندا هیچ دەقێك نییە بەراشکاوی ڕێ بەو جۆرە زەواجە بـدات. ئایەتێك لە قورئاندا هەیە کە گوتارەکەی ئاراستەی موسڵمانانە بـۆ ئـەوەی هـەتیوان بـەخێو بکـەن. ئـەو دەقـەش لـە سـورەی (النسـاء-ئـافرەت) ئایـەتی ٥-٦) هـاتووە: "مـاڵی خۆتـان مەدەنـە دەسـت کـەم ئـاوەزان، بـەڵام جلـك و بژێوییان لـە مـاڵی خۆتـان بـۆ دابین بکـەن و بەرووی خۆشەوە بیاندوێنن. هەتیوان تاقی کەنەوە تا دەبنە گەنجی ڕەسیدە (هـەتا خۆیـان دەناسـن)، جا ئەگـەر دیتـان خـاس و خـراپ لەیەکتر جویَ دەکەنەوە، ئەوسا ماڵیان بدەنەوە."

بەگوێرەی ئەو دەقەی قورئان مرۆڤی موسڵمان ئەگەر ئەو ئەرکانەی خوارەوەی لە بەرانبەر هەتیو لە ئەستۆدایە:

١- نانیان بدات. بژێوییان بۆ دابین بکات.

٢- جل و بەرگیان بۆ پەیدا بکات.

٣- دایاننێتە بەر خوێندن و پەروەردەیان بکات.

٤- تاقییان بکاتەوە، ئاخۆ لەرووی ئاوەز و سێکسەوە پێگەیشتوون، ئەگەر ئەم دووەیان هەبوو، ئەو هەتیوانە لە خەم دەردەچن، خۆیان دەبنە بەرپرسی ژیانی خۆیان.

وەك لە مەرجی چوارەمدا دەردەکەوێت، کە ئەو دەقەی قورئان جەخت لەسەر پێگەیشتنی عەقڵی و سێکسی هەتیو دەکات بۆ ئەوەی ماڵ و موڵکی خۆیان بەخۆیان بەکاربێنن. سەبارەت بە کارەکەی ئێمەوە ئەوەیە ئەو کەسەی لەرووی سێکسیەوە خۆی نەناسێت، بالق نەبێ، (عادەبوونی نەبینێ) شایانی ئەوەی نابێ کە زەواج بکات، چونکە خودی زەواجیش پەیوەستە بە پێگەیشتنی عەقڵیەوە.

لەبەر رۆشنایی ئەو دوو ئایەتەی سورەی (النساء)دا هیچ موسڵمانێکی خاوەن ئاوەز ئیدارەی کاروباری دارایی ناداتە دەست کچێکی خۆناناسیوی تەمەن حەوت ساڵە، چونکە ئەمە لەگەڵ قورئان تێکناکاتەوە!

جا ئەگەر ئێمە متمانە بە کچێکی تەمەن حەوت ساڵە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی نەکەین، بێگومان ئەو کچە لەرووی عەقڵی و جەستەیەوەش ناگونجێ کە زەواج بکات!

وەك پێشتر گوتمان ئەو لێڵی و تارماییە دەربارەی تەمەن و زەواجی عائیشە لە دەمی هەندێك زانای موسڵمانەوە هاتووە، ئەوەتە

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدەکەی-بەرگی شەشەم، لاپەڕە (٢٣) و لاپەڕە (٩٩) "بانگەشەی" ئەوە دەکات کە "عائیشە تەمەن نۆساڵی ئەوەندەی مژۆڵی بوکانێ (یاریکردن بە ئەسپی یاری) بووە، ئەوەندە ئەرکی خۆی وەك ژنێك پێ نەدەکرا".

بەراستی دژوارە مرۆڤ باوەڕ بەو دەقە بکات. ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

**هۆی یەکەم:** ئەبوبەکری گەورە بڕواداری ناو موسڵمانان رازی بێت کچێکی حەوت ساڵانەی خۆی کە هێشتا خەریکی وازی و بوکانێ بێت بە پیاوێکی تەمەن پەنجا ساڵی بدات!

**دووەم هۆ:** بە هەمان دژواری بەڵکو زیاتریش مرۆڤ ناتوانێت خەیاڵی ئەوە بکات یان هەرگیز ئەوەی بە خەیاڵ دابێت کەسێکی وەك پێغەمبەر ( درودی خوای لە سەر ) کچێکی تەمەن حەوت ساڵانە بێنێ.

ئەرکێکی تری گرنگ کە بەگوێرەی دەقە قورئانییەکە لە ئەستۆ بگرین و کاری بەخێوکەرە "فێرکردنی هەتیوە ، پەروەردەکردنیەتی" با ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین: چەند کەس لەئێمە باوەڕی وایە کە ئێمە دەتوانین منداڵەکانمان بەتەواوی و بەدروستی پەروەردە بکەین پێش ئەوەی دەگەنە تەمەنی حەوت ساڵی یان نۆساڵی؟ بێگومان وەڵامەکە "کەس"مان دەبێت. لەرووی لۆژیکەوە. بەراستی ئەرکێکی دژوارە کە منداڵێکی حەوت ساڵانە

بەشێوەیەکی پڕ ڕەزامەندی پەروەردە بکەین. لەم ڕوانگەوە چۆن دەتوانین باوەڕ بەوە بکەین کە عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا-کە لە نەزەر هەندێك کەسەوە تەمەنی بەشودانی بووە- تەواو پێگەیوەو تەواو ڕۆشنبیری سێکسی وەرگرتوە؟!

ئەبوبەکر لە هەموومان دادوەرتر بووە، بۆیە ئەو بە تەواوی لە بەرانبەر کچەکەشی هەروا بووەو زانیویەتی کە عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا منداڵ بووەو بەگوێرەی قورئان ئەو منداڵە لەو تەمەنەدا تەواو ڕەسیدە نەبووە تاکو چاك و خراپ لەیەك جیابکاتەوە. بۆیە هەرگیز ڕازینەبووە کچەکەی لەو تەمەنە بە هیچ کەسێك بدات. ئەگەر پرۆپۆزەل، پێشنیازی داواکردنی-داخوازی کچێکی خۆنەناسیو لە ڕووی سێکسەوە یان هەتا بڵێی کچێکی حەوت ساڵانەی پەرورەدەکراوی وەك عائیشە هاتبوایە لای پێغەمبەر، ئەوە پێغەمبەر دەسبەجێ ئەو پێشنیاز و داخوازیەی ڕەتدەکردەوە، چونکە نە پێغەمبەر و نە ئەبوبەکر ناتوانن پێشێلی هیچ پەرەگرافێکی یاخود بەندێکی قورئانی پیرۆز بکەن.

**لەم بەڵگەیەش دەگەینە ئەم ئەنجامە:**

بانگاشەی زەواجی عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا خۆی لەخۆیدا پێشێلکردنی پێویستی و مەرجەکانی پێگەییوی (خۆناسینی سێکسی) لە قورئان دەگەیەنێ، چونکە بەپێی قورئان کچ هەتا نەگاتە قۆناغی خۆناسین لەڕووی لۆژیك و ئاوەز و جەستەوە

ئامادەگی زەواجی تێدانیە، لەم پێودانگەوەش، ئەو بانگەشەیەی کە لە هەندێ کتێبی کۆنەوە دەرهەق زەواجی عائیشەیەکی خۆنەناسیو کراوە، جگە لە ئەفسانە هیچی تر نییە.

## بەڵگەی نۆیەم: رازیبوون لە هاوسەرگیری

لەئیسلامدا، ئافرەت دەبێ راوێژی پێبکرێت و رای وەربگیرێ، ئەویش رازی بێت بۆ ئەوەی هاوسەرگیرییەکە شەرعی بێت.

**(مشکاة المصابیح- وەرگێڕانی جەیمس رۆبسن، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٦٦٥)**

لەرووی بنەماکانی ئیسلامەوە (رێپێدانی متمانەپێکراو ئافرەتان- ئازادی پێدان بۆ گوزارشت کردن لە رای خۆیان) مەرج و پێداویستییەکی زەروریە بۆ ئەوەی هاوسەرگیرییەکە شەرعی بێت. هیچ جۆرێ خەیاڵ ناکرێ ئەو رێپێدانەی کچێکی خۆنەناسیوی تەمەن حەوت ساڵانە دەیدات بەهیچ جۆرێك دەسەڵاتێکی شەرعی بێ بۆ هاوسەرگیری.

هێندە نالۆژیکیە کە باوەڕ نەکرێ ئەبوبەکرێکی رۆناکبیر روخسەتی کچێکی حەوت ساڵانە بدات شوو بە پیاوێکی پەنجا ساڵی بکات. بەهەمان شێوە هەرگیز پێغەمبەر روخسەتی کچێکی حەوت ساڵانە وەرناگرێ. کە بە قسەی موسلم ئەوەندە بچووك بووە یاریەکانی

لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی پێغەمبەر لەگەڵ خۆی بردبێت. چ لۆژیکێک ئەوە قەبوڵ دەکات پێغەمبەر کچێك بێنێ شەوی بوکێنی یارییەکانی لەگەڵ خۆی بێنێ؟! نەدەبوو موسلیم بەهیچ جۆرێك ئەو (ئەفسانەیە!) لەناو کتێبەکەی دابنێت!!

لەم بەڵگەیە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر کچێکی حەوت ساڵانەی نەهێناوە، چونکە ئەو دەیزانی ئەمە پێشێل کردنی بنەماکانی هاوسەرگیری ئیسلامیە، بۆیە پێغەمبەر عائیشەیەکی ژیر و خاوەن ئاوەز و خۆناسیوی هێناوەو گێڕانەوەی دروست ئەمەیە هەرچیەکی تر لە هەرکوێ هاتبێ جگە لە ئەفسانە هیچی تر نییە!

## کورتەی توێژینەوەکە :

نە لە کەلتوری عەرەبدا هەبووە کچێکی حەوت ساڵی یان نۆساڵی بدەنە شوو. نە پێغەمبەریش لەو تەمەنە عائیشەی هێناوە. عەرەبی جەزیرە دژی ئەو هاوسەرگیرییە نەبوونە، چونکە بەهیچ جۆرێك هاوسەرگیری ئەوها وەك لە گێڕانەوەکاندا هاتووە لە ئەرزی واقیعدا رووی نەداوە:

گێڕانەوەی هیشامی کوڕی ئوروە سەبارەت بە شوکردنی عائیشە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بەهیچ جۆرێك بەراست دانانرێت، چونکە چەندەها گێڕانەوەی تر هەن تەواو هەڤدژن لەگەڵ ئەو گێڕانەوەی وی. وێڕای ئەمەش. هیچ لۆژیکێك لەوەدا نیە کە ئەو گێڕانەوەی

هیشام بە دروست وەربگیرێت، چونکە زانایان لەنێویان مالیکی کوڕی ئەنەس ئەو گێڕانەوەی هیشامی بە بێ بنەماو بێ متمانە داناوە، هەروەها هۆی ئەو رایەش ئەوەیە هیشام کە ئەو گێڕانەوەیەی کردووە لە عێراق بووە، زاکیرەی لاواز بووەو ئەوانەی لەویشیان گێڕاوەتەوە جێگای متمانە نەبوونە!

ئەو قسانەی لە کتێبەکانی تەبەری و بوخاری و موسلیم سەبارەت بە تەمەنی عائیشە هاتوون لەگەڵ یەك ناکۆکن و یەکتر هەڵدەوەشێننەوە، بۆیە لەو بابەتەوە زانستی نین. لەمەش زیاتر، زۆرێك لەو زانایانە هەتا لە نوسینەکانی خۆیان رای هەڤدژی یەکتریان تۆمارکردووە.

لەم پێودانگەوە، بەراشکاوی دەڵێین گێڕانەوەی تەمەنی عائیشە لەکاتی شوکردنی بە پێغەمبەر جێگای متمانە نییە، چونکە لەو نوسینانە هەڤدژییەکی روون هەیە.

لە ئەنجامدا، هیچ هۆیەك نییە باوەڕ بەو زانیاریانەی تەمەنی عائیشەوە بکەین، چونکە لەروانگەی ئیسلامەوە، دەرفەتی تەواو هەیە ئەو جۆرە "قسانە" رەدبکەینەوەو هەتا بە ئەفسانەی دابنێین. وێڕای ئەمەش قورئانی پیرۆز بەراشکاوی زەواجی کچی خۆنەناسیو و هەروەها کوڕی نابەلەق رەددەکاتەوە، هەروەها بەرپرسیارێتیشیان پێ ناسپێرێت.

## سەرنج:

١- شانەڤاز دکتۆرە لە میشیگان. ئەم نووسینە بۆ یەکەمجار لە ئازاری ١٩٩٩ لە minaret بلاوکراوەتەوە.

٢- مامۆستا موسعەبی کوڕی مەلا جەمیلی شاوێسی ئەم دەقە ئینگلیزییەی کاتێك لە لەندەن بووم بۆ ناردم.. هەروەها ئەوەندەی من ئاگام لێبێت کاك موسعەب ماوەیەك بوو خەریکی ئەم باسە بوو، هەتا نووسینێکیشی بەسودوەرگرتن لە هەندێك سەرچاوەی عەرەبی نووسیوە.. بۆیە من سوپاسی دەکەم.

٣. وەك لە پێشەکیەکە ئاماژەم پێدا تەمەنی عائیشە چەند بێت ٩ ساڵیی یان ١٨ ساڵیی هیچ لە باوەڕی ناگۆڕێت ، چونکە وەرگێر باوەڕی وایە کە پێغەمبەر ، پێغەمبەر بووە بۆیە بە فەرمانی خودا عائیشەی هێناوە ، زاتی خوداش هەموو کارەکانی بە جێن . بەڵگەکانی نووسەر لۆژیکین و هەموو لە ژێدەری ئیسلامی وەرگیراون ، بۆیە لەو ڕیوایەتەی هشام لە عیراقی فیتنە مەقبولترن و نزیکترن لە گیانی ئیسلام و ژێدەرە متمانەپێکراوەکان.

## تەوەرەی سێیەم

## خوێندنەوەیەك بۆ هزری د.سروش

لەم تەوەرەیەدا هەوڵدەدەیین نووسینەکە بە پێوەری ئەکادیمی دابڕێژین ، چونکە بابەتەکە وا دەخوازێت لە سەری بدوێین . بۆ ئەوەی خوێنەر وەڕس نەکەین هەروەها دەربارەی میتۆدی نامەکەش دەڵێین میتۆدەکە لە سەر هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی عەبولکەریم سروش و وەرگێرەکەی دامەزراوە!!

**ئاڕیشەی بیرۆکەی ( سروش ):**

بیرۆکەی سروش دەربارەی زاتی خودا و قورئان وەك دەقێکی ئیلاهی کەم و زۆر کاریگەری هەیە !سروش سەرەتا بە پەنهانی یان بە شاراوەیی قسە لە سەر هزری ئاییني خۆی دەکات . ئەمەش وا لە خوێنەری کورد کردووە تەواو دەرك بە هەقیقەتی هزرەکەی نەکات ! جا ئەو کەسانە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام بن یان بە ناو لە چوارچێوەی ئایین دابن گرینگ نییە چونکە هەندێ کتێب و وتاری سروش لە میدیای کوردی وەڵامی ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەدەنەوە وێرای ئەوەش ، وتارەکانی سروش ئەوەندە بە " بوێری " نووسراون کە کۆمەڵگای تەقلیدی کوردی قەبوڵی ناکات ، بۆ نموونە

لە دیدارێکدا لە گەڵ گۆڤارێکی هۆڵەندیدا بە ڕاشکاوی دەڵێت :" قورئان بەرهەمی بیرکردنەوەی موحەمەدە "هەروەها وەك هەندێ ڕۆژهەلاتناس سروش باوەڕی بەوە نییە کە وەحی قورئان وەحی کەلامی بێ لە نێوان خودا و پێغەمبەر . بەلکو ئیلهامی خودی پێغەمبەرە !

+ ئامانجی لێکۆڵینەوەکە

توێژینەوەکە چەند ئامانجێکی هەیە :

١. دیارخستنی بیرۆکەی (د. سروش) .
٢. هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی سروش .
٣. قسەکردن لە سەر ئەو کەسەی کاریگەر بووە بەو بیرۆکەیە .

+ گریمانەکانی لیکۆڵینەوەکە

نووسەری بیرۆکەکە-سروش و وەرگێڕەکەی کە ئەحمەد قەبەنچییە- چەند گریمانێك بۆ بیرۆکەکە دەکەن :

١. هەر دوو لا گریمانی ئەوە دەکەن لە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچوون ، ناو لە خۆیان دەنێن " مفەکری ئیسلامی ".
٢. ئەوان دەڵێن ئەگەر ئیسلام دەیەوێت " لە ڕەوڕەوەی مێژوو و زانست " دوا نەکەوێت دەبێ ئیسلامێکی مەدەنی و لیبرالی بێت.

٣. ئەوان لە ئیسلامی تەقلیدی دەرچوون و خەریکی ئیسلامێکی مەدەنیین.

+ **سنووری بابەتەکە**

بۆ ئەوەی زۆر لە بابەتەکە دوور نەکەوینەوە ، نووسینەکەمان وەك دەڵێن عەرش و قورش لە خۆ نەگریْ تەنیا قسە لە سەر گریمانانە دەکەیین . کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێداوە.............

+ **گرینگی و بەهای بابەتەکە**

بۆ کیْ گرینگە ؟؟ بە ڕاستی ئەم نووسینە بۆ ئەوانە گرینگە لە بواری بیرۆکەکە کار دەکەن . وەك گوتمان کاریگەری بیرۆکە لە باشووری کوردستان هەیە . جا گرینگە نەوەی نویْ لە ئیسلامی ئیلاهی و ئیسلامی مرۆڤکردە تێبگات ، نەك بە ناوی فەلسەفە و بیری ئازاد لە ڕەوڕەوەی مێژوو بکەویْ و بچێتە زبڵدانی مێژووەوە وەك ئەو دوو " بیرمەندە نا-ئیسلامیە ".........

**ناساندنی ئەو دوو بیرمەندە**

سروش و قەبانچی لە میدیای کوردیدا حزوریان هەیە ، بە تایبەتی کەسێکی وەك سروش وەك بیرمەندێکی ئیسلامی دەناسرێت ! گۆڤارێکی وەك (      ) ،کە کۆمەڵە نووسەرێکی ئیسلامی دەریدەکەن ، قسەکانی سروش ڕووبەرێکی فراوان داگیردەکەن

